شتێڤان تسڤایک

# نۆڤلێت

# شەترەنج

وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە

عەبدولموئمین دەشتی

بەرلین 2002

وەزارەتی رۆشنبیری

بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان

زنجیرەی:(      )

ناوی کتێب: نۆڤلێتی شەترەنج

نووسینی : شتێڤان تسڤایگ

وەرگێڕانی لە ئەلمانییەوە: عەبدولموئمین دەشتی

وێنەی بەرگ: لە ئۆریگینالی ئەلمانییەکە وەرگیراوە.

چاپی یەکەم: 2002 / چلوحەوتەمین چاپی ئەلمانی وەرگێڕدراوە بۆ کوردی. کە لەبنکەی بڵاوکردنەوەی (فیشەر) لە ساڵی2000 لە شاری فرانکفۆرت ئەم ماین بڵاوکراوەتەوە.

ناوی کتێب بە ئەلمانی :Schachnovelle

ئەم وەرگێڕدراوە لە لایەن وەزارەتی رۆشنبیرییەوە بڵاوکراوەتەوە

کاری ئەو وەرگێڕانەم وەك دیارییێکی زۆرسادە پێشکەشی ئەو کوردە

نیشتمانپەروەر و قارەمانانە دەکەم، کە لە پێناوی بیروباوەڕی سیاسی خۆیاندا، لە کونجی بەندیخانەکانی ڕژێمی دکتاتۆرو دژبەگەلی بەعسە فاشیستەکان، ژیانی ئازادییان بۆ هەمیشە، یان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێ زەوتکرا، لەگەڵ ئەوەشدا وەك پۆڵا ڕووبەڕووی ئەشکەنجەو ئازاردانی گیانی و جەستەیی وەستان، نە پەشیمانییان پێشانداو، نە نهێنییە پیرۆزەکانی خۆیان ئاشکراکرد.

وەك دوا سەعاتی پێش بە ڕێکەوتنی هەر سەفەرێك، غەڵبەغەڵب و هەراییێکی زۆر لەسەر پشتی ئەو کەشتییەدا لە ئارادا بوو، کە لە نیوەشەوی ئەم ڕۆژەدا لە (نیۆیۆرك)ەوە بەرەو (بۆینۆس ئایرس) دەچوو. گوندییەکان بە ناو یەکتریدا چرژابوون و قەرەپەستانێیان بوو بۆ مالئاوایی و بە ڕێکردنی دۆستەکانیان. لاوە

تەلەگرافچییەکەش بە خۆو بە کلێتە لارەکەی سەری، بە ناو ئاپۆڕەی خەڵك و ناو ژوورەکان دەسووڕایەوەو ناوی خەڵکی بانگ دەکرد، هەر گوڵ و جانتا بوون هەڵدەگیران و رادەکێشران، منداڵان بە خۆشیەوە بە سەر پلیکانەکان دەکەوتن و دادەبەزینە خوارەوە، لەولاشەوە لەسەر تەختەی شانۆ تیپی ئۆرکێسترا بێ ماندووبوون خەریکی مۆسیقا ژەنین بوو. لەگەڵ ناسیاوێکم لەسەر ڕووتەختی کەشتییەکە کەمێك لە دووری ئەو هەرایە وەستا بووم، کاتێکم زانی دوو سێ جار بروسکەی تیشکێکی بەهێز سەرنجی راکێشام. تومەزا کەمێك بەر لەوەی کەشتییەکە بجوولێتەوە، چەند رۆژنامەنووسێك دێمانەیەکیان لەگەڵ کەسایەتییێکی ناسراو ئامادەدەکردو، خەریکی وێنەگرتنی بوون. برادەرەکەم تەماشاییێکی ئەویێی کرد و بە زەردەخەنەوە ووتی:"لەم کەشتییەدا تەیرێکی نایابتان لەگەڵدایە. چێنتۆڤیچ، میرکۆ چێنتۆڤیچ پالەوانی جیهانیی، بۆ پێشبڕکێ، تەواوی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا گەڕاوەو، ئێستاش خەریکە بۆ پێشبڕکێ دەچێتە ئەرجەنتین".

جا بەراستی ئەوا ئێستا ئەو لاوە پالەوانە جیهانییەم هاتەوە یاد، تەنانەت هەندێ لایەنی ژیانی ئەوم، کەپەیوەندی بە سەرکەوتنی خێرای کەسایەتی ئەو هەیە، بە وردی هاتەوە بیر" دۆستەکەم کە رۆژنامەخوێنێکی وریایە، بە گێڕانەوەی کۆمەڵێك چیرۆکی عەنتیکەی ژیانی ئەو پاڵەوانە، بیرەوەرییەکانی منی تەواوکرد. نزیکەی ساڵێك لەمەوبەر چینتۆڤیچ بە بازێك لەهیکڕا خۆی گەیاندە ریزی ئالجێخین، کابلانسا، تاراکۆڤەر، لاسکەر و بۆگولجوبۆڤی کۆنە پاڵەوانانی هونەری شەترەنج" ئیتر لەوەتەی کە رێتسیێڤسکی تەمەن حەوت ساڵە لە ساڵی 1922 بەشداری یاری پێشبڕکێی شەترەنجی کرد، هیچ رووداوێکی تر وەکوو ناوبانگی لە ناکاوی ئەو لاوە نەناسراوە سەرنجی گشتی بۆخۆی رانەکێشاوە. چونکە هیچ کەسێك لە ئاستی رۆشنبیری چینتۆڤیچ نەیدەتوانی بە هیچ شێوەیەك پێشبینی ئەوە بکات، کە ئەو کوڕە بگاتە ئەو پایە بەرز و دیارە. دیارە زووش ئەو نهێنییە کەوتە سەر زاران، کە ئەو پاڵەوانە لە ژیانی تایبەتی خۆیدا، هەرگیز لە توانایدا نەبووە کە بە هیچ زمانێك تاکە ڕستەیەك بەبێ هەڵەی رێنووسی بنووسێت، وەك هاوکارە تووڕەکەی لە داخی دڵی خۆی گاڵتەی پێ کردووەو وتوویەتی:"کۆڵەوارییەکەی لە هەموو لایەنێك لە جیهاندا یەکەمە".

ئەو کابرایە کوڕی کەشتییەوانێکی لاواز و نەخۆشی سەر رووباری (دۆناو) بوو، شەوێك کەشتییە چارۆگەدارە بچووکەکەی باوکی دەکەوێتە بەر پاپۆڕێکی دانەوێڵە. ئیتر ئەو منداڵە دوازدە ساڵییە دوای مردنی باوکی دەکەوێتە لای قەشەی ناوچەکەو، قەشە بەزەیی پێدا دێتەوەو دەیگریتە خۆی. قەشە زۆر خۆی پێوە ماندوو دەکات و دەیەوێت یارمەتی ئەو منداڵە سەرگێژ و نێوچەوان پانە بدات، بۆ ئەوەی ئەو وانانەی کە لە قوتابخانەی گوند فێریان نەدەبوو، لە ماڵەوە فێری بکات.

بەڵام ڕەنجی قەشە بە فیڕۆ دەڕوات وسوودی نابێت. ئەو پیتانەی کە سەت جار بۆی رۆشن دەکرایەوە، لای میرکۆ هەر نامۆ دەمانەوەو میرکۆ تەقەی سەری دەهات" مێشکێکی تەمبەڵی

هەبوو، توانای فێربوونی ساکاترین وانەی نەبوو. تەمەنی ببوو بە چواردە ساڵ و هێشتان بۆ ژماردن حەوجەی ئەنگوستەکانی بوو، خوێندنەوەی کتێبێك یان رۆژنامەیەك بۆ ئەو مێردمنداڵە کارێکی ستەم و دژوار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا نەتدەتوانی وەك مرۆڤێکی بێ هودەو نەگونجاو ناوی بەریت. چونکە ئەو زۆر گوێڕایەڵ بوو، بۆ ئەو کارانەی کە پێی دەسپێردران، ئاوی دەهێنا، داری دەشکاند، هاوکاری کاری کێڵگەی دەکرد، متبەقی رێکدەخست، لە جێبەجێکردنی ئەو کارانە جێگەی متمانە بوو، ئەگەرچی کارەکانی زۆر بە هێواشی و درێژدادڕی جێبەجێ دەکرد, بەڵام ئەو شتەی کە قەشەی دەهری کردبوو، ئەوە بوو، ئەو کوڕە گێژە زۆر دوورە پەرێز بوو، لە خۆوە بەشداری هیچی نەدەکردو، ئەگەر پێی نەگوترابایە یان فەرمانێکی پێ نەدرابایە هەرگیز خۆی لە گوورە نەدەبرد، تەنانەت قەت پرسیارێکیشی نەدەکرد، تێکەڵی گەمەی هاوتەمەنەکانی نەدەبوو، هەوڵی نەدەدا خۆی بە شتێك خەریك بکات، ئەگەر بە تایبەت نەخرابایە سەر سکەی شتێك" هەرکە کارە پێ سپێردراوەکانیشی تەواو دەکرد،دەخزایە ژوورەوەو بە چاوی ئەبڵەق دادەما، نیگاییێکی خاڵی، وەك ئەوەی لە لەوەڕگاییێك لەگەڵ مەڕاندا بێت، کەمترین بەشداری لە رووداوەکانی دەوروبەری خۆی نەدەکرد. لەو کاتەی کە ئێواران قەشە قەننە جوتیارییە درێژەکەی خۆی دادەگیرساندو بە چەققەدوکەڵ لەگەڵ سەردەستەی پۆلیسی گوندەکە خەریکی یاری شەترەنج دەبوون، ئەو کوڕە قژسیسە وەك لارێك لە تەنیشتیانەوە لەسەر چینچکان دادەنیشت وبە نیوەچاوێك وەك ئەوەی خەوتووبێت، بێبایەخانە بەرامبەر تەختە خانەدارەکەی شەترەنج دادەما.

ئێوارەیەکی زستانە لەو کاتەی قەشەو پۆلیس رووچووبوونە ناو ململانێی شەترەنجی رۆژانەیان، دەنگی زەنگوڵەی گالسەکەیەك لە جادەی گوندەکە بە خێرایی نزیك دەکەوتەوە، جوتیارێك بە خۆو بە کلێتەی بە بەفر سپی بووی، بە هەڵەداوان خۆی کوتایە ژوورەوەو، رایگەیاند کە دایکە پیرەکەی لەسەرەمەرگدایە، ئەگەر قەشە حەزبکات بەپەلە خۆی بگەیەنێتێ وبەرلەوەی گیانی دەرچێت، بە دواڕۆنی پیرۆز چەوری بکات[*] . بێ دواکەوتن قەشە کەوتە دوای کابرای جوتیار. سەردەستەی پۆلیسانیش کەهێشتان ئاوجۆکەی خۆی تەواو نۆش نەکردبوو، لەوکاتەی خەریکبوو بۆ رۆیشتن قەننەیەکی تری دادەگیرساند و دەیویست پۆستالە قورسەکەی لە پێ بکات، چاوی لە ئەبلەق ماوی میرکۆ سەرنجی راکێشا، کە چۆن بەرامبەر تەختەی شەترەنجەکە دامابوو. "ها چیە، دەتەوێ یارییەکە تەواو بکەیت؟" پۆلیس بە گالتەجاڕی ئەو پرسیارەی لێ کرد، دیارە هیچ گومانیشی لەوەدا نەبوو، کە ئەو لاوە خەوالّووە ناتوانێت تاکە بەردێکیش بە بێ هەڵە بخاتە سەرتەختەی شەترەنج. میرکۆ بە شەرمەوە تەماشای تەختەکەی کرد، سەری رەزامەندی ڕاوەشاندو لەسەر جێگەکەی قەشە دانیشت. دوای چواردە جوولە سەردەستەی پۆلیسان بەزی، وە دانی بەوەش دانا کە دۆڕانەکەی بە هۆی غافلگیری، یان

[*] رۆنێکی پیرۆزە، وەك دوا ئەرکی ئاینی لە مەزهەبی کریستی کاسۆلیکی، لەسەر مەرگدا مردووی پێ چەور دەکەن.

جوولەیەکی بە هەڵە نەبووە. وە ئەنجامی گەمەی دووەمیش لە هی یەکەم باشتر نەبوو. کاتێ قەشە گەڕاوەو ئەمەی لە پۆلیس بیست، هاواری لێ هەستا: "ئای لە تۆ! کەرەکەی بیلیام!" دەڵێن دوو هەزار ساڵ بەر لە ئەمڕۆ پەڕجوویێکی لەم بابەتە روویداوەو بوونەوەرێکی بەستەزمانیلار زمانی ژیرایەتی دۆزیوەتەوە، چیرۆکەکەی کتێبی پیرۆزی بۆ پۆلیس گێڕایەوە. هەرچەندە کاتیش درەنگ بوو، بەڵام قەشە نەیتوانی خۆی بگرێت و داوای پێشبڕکێی دوو قۆڵی لەو مامۆستا نەخوێندەوارە نەکات. ئەوە بوو لاوە بە ئاسانی قەشەشی بەزاند. میرکۆ زۆر بە چیڕی، بە هێمنی، بێ خۆتەنگاوکردن، بە بێ ئەوەی تاکە جارێکیش نێوچەوانە پانەکەی خۆی لەسەر تەختەی شەترەنج بەرز بکاتەوە، گەمەی دەکرد، بەڵام بە باوەڕبەخۆبوونێکی بەتینی دوور لە دوودڵی" لە رۆژەکانی دواتریش نە سەردەستەی پۆلیسان و نەقەشەش نەیانتوانی تاکە جارێکیش لێی ببەنەوە. قەشە کە لە هەموو کەس باشتر شاگردەکەی خۆی دەناسی، ببوو بە مەراقێکی گەورە لە دڵی، کە ئایا تا چ رادەیەك دەبێت ئەو بەهرە تاقانەو یەکلایەنەی ئەو لاوە بەرگەی تاقیکردنەوە بگرێت؟ ئیتر بۆیەش بردی بۆلای سەرتاشی گوند و پرچە ئالۆز و سیسەکەی بۆ چاکرد، تا هەندێك رووی ناو خەڵکی هەبێت، سواری گالسکە بوون و لەگەڵ خۆی

بە پێی میتۆلۆژیاو چیرۆکەکانی تەورات بیلیام پیاوچاکێك بووە، رۆژێك لە سەفەرێکدا بە ناڕەوایی چەند جارێك بە نەقیزە لە کەرەکەی خۆی داوە، چونکە رێی نەکردووە، لە ناکاو بە کاری خودا کەرەکە بەقسە هاتووەو بەرگری لەخۆی کردووە، پاشان فریشتیەکی خوداش دێت و سەرزەنشتی دەکات، ئیتر بلیام داوای لێبوردن لە خوداو لە کەرەکەی دەکات.(وەرگێڕ)

بردی بۆ شارە نزیکەکەی لای خۆیان. لەوێش یەکسەر بۆ قاوەخانەکەی مەیدانی گوند، ئەو قاوەخانەیەی کە گۆشەیەکی ببوو بە مۆڵگای یاریکەرانی شارەزای شەترەنج. کە بەپێی ئەزموون بۆ قەشە دەرکەوتبوو، کە هەموو ئەوانەی لەوێ کۆدەبووونەوە پتر لەخۆی شارەزای شەترەنج بوون. کاتێك قەشە ئەو کوڕە پازدە ساڵییە پرچ سیس و روومەت سوورەی راکێشی ناو قاوەخانە کرد، دانیشتووی قاوەخانەکە بە سەرنجێکی بێ بایەخەوە تەماشایان کرد، میرکۆ کەرکێکی خوری شۆڕی لەبەر بوو، پۆتینێکی قورس و درێژی لە پا بوو، بە شەرمەوەو بە چاوی نیوەقوچاوەوە لە گۆشەیەك وەستا، تا ئەو کاتەی بۆ سەر مێزێکی شەترەنج بانگیان کرد. لە یەکەم گەمە میرکۆ دۆڕاندی، چونکە ئەو چ جاران دەستپێك و کردنەوەی سیزیلیانی لە یارییەکانی قەشە باشەکەی خۆی نەدیتبوو، پێی نامۆ بوو. بەڵام لە یاری دووەم لەگەڵ باشترین شەترەنجزانی ئەوێ کەس لەکەس دەچوو. ئیتر لەیاری چوارەم وپێنجەم بەسەرەوە، یەك بە یەك لە هەموو یاریکەرانی قاوەخانەکەی بردەوە.

لە پارێزگا سلاڤییەکانی باشوور کەم رووداوی وا سەرنجراکێش روو دەدات، بۆیە دەرکەوتنی ئەو کوڕە لادێییەو بردنەوەی پارەیەکی زۆر لە هیکرا، شتێکی زۆر عەنتیکەو سەرنجڕاکێش بوو. بێ ئەملاو ئەولا، هەموو بەیەك دەنگ هاتنە سەر ئەو بریارە، کە گەرەکە ئەو کوڕە چەند رۆژێکی تریش لە شار بمێنێتەوە، بۆ

سیزیلیەن: گەورەترین دورگەیەلە دەریای ناوەڕاست و سەر بە ئیتالیایە (وەرگێڕ، سیزیلیانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناوچەیە)

ئەوەی ئەندامەکاتی تری یانەی شەترەنج بانگبکرێن، بە تایبەت (سیمچین) ئاغای شەترەنجزانی بەناوبانگ، پێویستە زوو بچنە کۆشکەکەی و ئەو هەواڵە بگەیەننە ئەو یاریکەرە پەڕگرەی شەترەنج. قەشە بە شانازییێکی تەواو تەماشای کوڕە پەروەردەکراوەکی دەستی خۆی دەکرد، دۆزینەوەی ئەو بەهرەیە لە کوڕەکەی، خۆشحالی کردبوو، بەڵام ئەو نەیدەتوانی دەست لە پێشنوێژی رۆژی یەکشەممە هەڵبگرێت، بۆیە بڕیاری دا بۆ تاقیکردنەوەی پتر میرکۆ لەوێ بە تەنها بەجێبهێڵێت، ئیتر لە کیسەی یانەی وەرزش لاوەیان بردە هوتێل، ئەم ئێوارە بۆ یەکەمین جار میرکۆ چاوی بە ئینجانەی تەوالێتی شارییانە کەوت. دوانیوەڕۆی رۆژی یەکشەممە قاوەخانە جمەی دەهات لە دۆستانی شەترەنج. چوار سەعاتان بەبێ جوولە میرکۆ لەسەر مێزی شەترەنج بە براوەیی یاری کرد، بێ ئەوەی تاکە وشەیەکی لە زار بێتە دەرەوە، یان تەماشای لاییێك بکات، بە ریزە لە هەموو یاریکەرەکانی بردەوە" ئەوە بوو لە کۆتاییدا یاریکەران پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە یاری بە کۆمەلیان لەگەڵدا بکات، بەڵام زۆری ویست تا ئەو نەخوێندەوارەیان تێ گەیاند، کە مەبەست لە یاری بەکۆمەڵ ئەوەیە کەلەیەك کاتدا ئەو دژی کۆمەلێك مێز یاری دەکات. ئیتر کە حاڵی بوو، سەری رەزامەندی راوەشاندو خۆی ئامادەکرد بۆ یاری، دەست کرا بە یاری. میرکۆ بە خۆو بە تەپەتەپی پۆتینە قورسەکەی بە هێمنی لەم مێزەوە دەچوو بۆ ئەو مێز، تا سەرەنجام حەوت لە هەشتی یارییەکانی بردەوە.

ئیتر راوێژکاری دەستی پێ کرد، هەرچەندە ئەو پالەوانە پڕ بە مانای وشە هی شار نەبوو، بەڵام هەستی شانازی نەتەوایەتی خەڵکەکەی وروژاندبوو، بەڵکو خوا ئاوڕێکیان لێ بداتەوەو، شارە بچووکەکەیان کە هەرگیز بوونی لە نەخشەی جیهاندا سەرنجی کەسی رانەکێشاوە، بۆ یەکەمین جا لە ژیانی خۆیدا شەرەف ئەوەی بەربکەوێ، پیاوێکی ناودار بنێرێتە ناو جیهان. دەلاڵێك کە ناوی (کۆلەر) بوو، کاری ئەوە بوو مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژ و سەماکەری بۆ کابارە و سەماخانەکان پەیدا دەکرد، ئامادەیی خۆی پێشاندا، کە ئەگەر بۆ ساڵێك کۆمەکی بکەن، ئەوا ئەو لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ ڤیەننا ولەلای شەترەنجزانێکی شارەزا دایدەمەزرێنێ، بۆ ئەوەی هونەرەکانی گەمەی شەترەنجی بە وردی فێربکات" سیمچین ئاغا، کە لە شەست سال یاری شەترەنج، هەرگیز شتی وا عەنتیکەی لە بەرامبەر خۆیدا نەدیتبوو، یەکسەر ئەو کۆمەکەی خستە ئەستۆی خۆی. ئیتر لەو رۆژەوە رۆژی بەختی ئەو کوڕەی کەشتییەوان دەستی بە هەڵاتن کرد.

دوای نیو ساڵ میرکۆ بەسەر تەواوی نهێنیەکانی شەترەنج زاڵ بوو، بەڵام کەموکورتییێکی کەم وێنەی هەبوو، کە پاشتر بازنەی پسپۆرەکانی شەترەنج سەرنجیان بۆ چوو بوو، ئەمەش ببوو بە خاڵی گاڵتەجاڕی بە میرکۆ، ئەویش ئەوە بوو میرکۆ هەرگیز فێری ئەوە نەدەبوو زنجیرەی هەنگاوەکانی تاکە یارییێکیش ئەزبەر بکات، یان وەك بە زمانی پسپۆری دەڵێن: ئەو هەمیشە کوێرانە یاری دەکردو بەهرەی ئەوەی نەبوو کە مەیدانی ململانێ بخاتە ناوایەی بێ سنووری خەیاڵ. دەبووایە هەمیشە تەختەی رەش و

سپی شـەترەنج، بـە شەسـت و چـوار خانـەو سـی‌و دوو بـەردەوە، لەبـەر چـاوو دەسـتی بووایـە" تەنانـەت لەوکاتەشـەوە کـە بـووە بـە پاڵەوانی جیهانی، هەمیشە تەختەیەکی شەترەنجی پێچراو لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێت، بۆ ئەوەی لە هەر جێگاییێکدا، ئەگەر یارییێکی وەستایانە بێنێتەوە بیری خۆی، یان لە شیکاری کێشەیەك بگەڕێت، هەموو بارەکە لەسەر تەختەی شەترەج راستەوخۆ بێنێتەوە بەرچاوی خۆی. ئەو کەمە کەڵێنە ئەو عەیبەی لێ ئاشکرا کردبوو، کە ناتەواوی و کەموکورتییەك لە هێزی ئەندێشەو شت هێنانەوەبەرچاو لە بەهرەی میرکۆدا هەیەو، بازنەی گەمەکارانی شەترەنج زۆر بەگەرمی باسی ئەو خاڵەیان دەکرد، وەك ئەوەی کە لە نێوان مۆسیقاراندا یەکێکی زۆر هونەرمەندو بەدەست، یان ئاماژکارێکی مۆسیقایی[*] بە بێ نۆتەنامەی سەرجەمی پارچە مۆسیقاییێك، هەرگیز بەهرەی ئەوەی نەبێت هیچ مۆسیقاییێك بژەنێت، بەڵام ئەو کەموکورتییە سەرنجڕاکێشە بە هیچ شێوەیەك نەببوو بە کۆسپ لە ڕێگەی بەرەو پێشەوەچوونی سەرسوڕهێنی ئەو. لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا کۆمەڵێك پاداشی شەترەنجی وەرگرت، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو بە پاڵەوانی وڵاتی هەنگاریاو لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوو بە پاڵەوانی جیهان.
هەموو قارەمانە بوێرەکانی شەترەنج، ئەوانەی کە لە بەهرەو ئاستی رۆشنبیری، لە هێزی فەنتازی، لە ئازایی بێ ڕادە لەم بالاتر بوون، هەموو بەرامبەر لۆگیکی چڕ و ساردو سڕی میرکۆ بەزین،

[*] ئامۆژکاری مۆسیقایی: مایسترۆ، دیریگێنت

هەروەك بەزینی ناپلیۆن بەرامبەر کۆرتۆزۆڤ وریەو تەوەزەڵ و، بەزینی هانیپال بەرامبەر فابیۆس کۆنکتاتۆر، کە وەك لیڤیوس بۆمانی دەگێڕێتەوە، ئەویش لە سەردەمی منداڵیدا تا بڵێی تەمبەڵ و گێژ و وێژ بووە.

بەو جۆرە لە پێشانگا قەشەنگەکەی وێنەی وەستایانی شەترەنج، بۆ یەکەمین جار وێنەی کابراییێکی لە بیر و زانست دابڕاو، کوڕە جوتیارێکی دەبەنگ و بێ دەم و پل، کە چ جاران رۆژنامەنووسە چیرەدرێژەکانیش نەیانتوانی بوو تاکە وشەیەکی بە سوودی لە دەم دا بپچڕێنن، لە ریزی وێنەی رۆشنبیرانی مەیدانە جۆراوجۆرەکانی زانست، لە فەیلەسوف و ماتماتیکزان و کەسانی بیرکەرەوەو خاوەن هێزی لێکدانەوەو خەیال هەڵواسرا. لەبەر ئەوەی کە چێنتۆڤیچ بەهرەی ئەوەشی نەبوو تەنانەت قسەی سوواوی ناو رۆژنامەکانیش دووبارە دەربڕێتەوە، بۆیە هەر زوو کۆمەڵێك ئەفسانەی جەڤەنگئامێزی لەبارە هاتبووە ئارا. ئەو پالەوانە بێ وێنەیە هەر کە لەسەر تەختەی شەترەنج هەڵدەستا، دەبوو بە کەسایەتییێکی سەیر و سەمەر" سەرەڕای چاوە رەش و درەوشاوەکانی، کراواتە[*] بە بریق و باقەکەی کە بە تۆقەیەکی بە دانەمرواری رازاوە ریك وەستابوو، پەنجەو نینۆکە خاوێن و چاك پۆلیشکراوەکانی، کەچی لە هەڵسوکەوت وجولانەوەو ئاکاری یەکسەرە دەچووەوە ناو قەپێلکی ئەوکورە جوتیارەی جاران، کە لەلادێ حوجرەکەی قەشەی گەسك دەدا. بە شێوەیەکی نزیکە زۆر



[*] کراوات: بۆینباخ

بێ شەرم و بێ هۆما هەولی ئاسوودەیی خۆی وتووڕەیی شەترەنجزانەکانی تری دەدا، بەوەی بەهۆی ئەو بەهرەو ناوبانگەی کە پەیدای کردبوو، بە تەماعگیرییەکی بێ شەرمانە دەیەویست تا دەکرێت، پارە کۆبکاتەوە. لەو شار دەچوو بۆ ئەو شار، هەمیشەش کام مێوانخانە هەرزان بوو لەوێ دەخەوت، بۆ ئەو ئەوە گرنگ بوو پارەیان پێ بدابایە، ئیتر ئەو ئامادەبوو لە خراپترین یانە یاری بکات. هەر بۆ پارەش بەوە رازی ببوو، کە وێنەکەی لەسەر رێکلامەی سابوون چاپبکرێت. بێ ئەوەی گوێ بداتە گالتەی بەرامبەرەکانی، کە هەموو دەیانزانی میرکۆ بەهرەی ئەوەی نیە سێ رستەی راست بنووسێت، لەگەڵ ئەوەش بنکەیەکی بازرگانی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە بە هۆی خوێندکارێکی گالیسی نامیلکەی (فەلسەفەی شەترەنج)ی بە ناوی میرکۆ بڵاوکردبووەوە. وەکو هەموو مرۆڤە وشك وساردو سڕەکان، لای ئەو پێکەنین مانایێکی نەبوو، لەو رۆژەوەش کە سەرکەوتنی لەیاری پێشبڕکێی جیهانی بەدەستهێنابوو، خۆی بە گەورەترین پیاوی جیهان دەزانی و وای دەزانی کە هەموو رۆشنبیر و قسەکەر و نووسەرە بەرزەکانی لە هەموو مەیدانەکاندا بەزاندووە. بەهۆی ئەو وا لەخۆگەیشتنەشی، دڵەڕاوکێ و باوەربەخۆنەبوونەکەی جارانی بۆ بەخۆنازینێکی سارد و سڕ و گەلحۆیانە گۆڕا بوو.

''ناوباگێکی وا خێرا، چۆن سەرێکی بۆش نافرێنێ؟'' بەو قسەیە برادەرەکەم هاتە کۆتایی هەندێك لە باسەکانی سەردەمی منداڵی چینتۆڤیچ.''کوریژگە جوتیارێکی تەمەن بیست و یەکساڵەی گوندی (بانات) چۆن سنگ دەرنەپەڕێنێ، ئەگەر ئەو لە ناکاوێکدا بە جولاندنی چەند بەردێك لەسەر تەختەدارێك، لە هەفتەیەکدا بەقەد ساڵێکی کاری سەختی داربڕین و کاری وەرزێری هەموو خەڵکی گوندەکەی پارەی بێتە دەست؟. بۆچی هەر وا بە سووك و سانایی خۆی بە مرۆڤێکی مەزن نەزانی؟ ئەگەر ئەو کەمترین زانیاری لە بارەی تەرزی ئەو ژیانە نەبێت، کە رێمبرانتێك، بێتهۆڤنێك، دانتییێك، ناپلیۆنێك، رۆژێك لە رۆژان بەسەریان برد؟ ئەو کوڕیژگە مێشك لە دیوارگیراوە تەنها تاکە شتێك دەزانێت، ئەویش ئەوراستیەیە کە چەندەها مانگە تاقە یارییێکی شەترەنجی نەدۆڕاندووەو، ئیتر ئەو ئاگای لەوە نیە کە جگە لە شەترەنج و پارە، بەهاو نرخی تر لەسەر ئەو زەویەدا هەیە، بۆیە مافی خۆیەتی ئەگەر ئاوا ڕا لەخۆبێت.

گێڕانەوەی برادەرەکەم بە تەواوی منی تووشی مەراق کرد. کۆبوونەوەی هەموو تەرزەکانی یەکانەیی لە تاکە بیری مرۆڤێکی داخراو، سەرنجی تەواوی منی بۆخۆی راکێشابوو، چونکە کەسێك هەرچەندە سنوور لە دەوری خۆی بکێشێت، ئەوەندە پتر لەلا بێ کۆتاییەکەی تر نزیك دەبێتەوە، ئەو جۆرە کەسانە وەکو ئەو مێروولە تێرمیتانەن کە بۆ دابڕانی خۆیان، بە ماددەیەکی تایبەت دیوار لە دەوری خۆیان دروستدەکەن، بەڵام وەکو شتێکی نایاب و عەنتیکە پتر سەرنجی خەڵك بۆخۆیان رادەکێشن. کارێکی ئاسان نیە، ئەو یەکلارۆشنبیرە تایبەتمەندە، لە سەفەرێکی دوازدە رۆژی تا (ریۆ) بخەیتە ژێر هاوێنەی پشکنین.

زوو برادەرەکەم هۆشیاری کردمەوە:"پێم وایە شانسێکی کەمت دەبێت، ئەوەندەی من ئاگادارم، کەس نەیتوانیوە کەمترین ماددەی پسوشۆلۆگی لە چێنتۆڤیچ دەربهێنێ، ئەو جوتیارە دوورە پەرێزە لە پشتی هەموو ئەو مەرزدراوییەی، زیرەکایەتییەکیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە بە ئاسانی خۆی ناخاتە دەستی کەس، ئەویش بە هۆی هونەرێکی سادە، جگە لە بازنەی لادێییەکان، کە لە مێوانخانە بچووکەکان یەکتر پەیدادەکەن، قسە لەگەڵ کەسی تر ناکات. هەر بزانێت لە شوێنێك خوێندەوارێك هەیە، خۆی دەکێشێتەوە ناو قەپێلکی خۆی، بەو جۆرە کەس بۆی ناچێتە سەر، تاکە وشەیەکی گێلانەی لێ ببیستێ، یان رادەی نەخوێندەواری و نارۆشنبیرییرکەی بپێوێت". جا بەڕاستی برادەرەکەم راستی گوت، رۆژی یەکەم بۆم دەرکەوت کە بە خۆڕەپێشکردنێکی زۆر نەبێت، ناتوانیت لێی نزیك ببیتەوە، منیش لەو کەسانەم کە ناتوانم بەزۆر خۆم لە رووداوەکان رەپێش بکەم. هەندێ جار لەسەر رووتەختەکەی کەشتی پیاسەی دەکرد، بەڵام دەستەکانی لە پشتی خۆی لێك گرێ دەداو، لە دەریای شانازی و روحگەورەییەکە ی نقووم دەبوو، کتومت وەکو وینە بەناوبانگەکەی ناپیۆن" هەونگاوەکانیشی لەو سوورەپیاسەیە ئەوەندە تەنگەتاو و خێرابوو، تا پێی بگەیت دەبوایە بەدوایدا ڕابکەیت. لە ژوورەکانی یەکتردیتن و مەیخانەو جگەرەکێشانیشدا هەرگیز دەرنەدەکەوت. ستیواردی کەشتییەکە باوەڕی بە من کرد و تێی گەیاندم، کە چینتۆڤیچ زۆربەی کاتی خۆی لە کابینەکەیدا بە مەشقی شەترەنج بەسەر دەبات، لەسەر



تەختەیەکی گەورەی شەترەنج راهێنان دەکات، یان یارییە کۆنەکان بەسەردەکاتەوە.

دوای سێ رۆژ ئۆقرەم لەبەر بڕابوو، هونەری خۆدوورە-پەرێزگرتنەکەی ئەو، بەهێزتر بوو لە ویستی نزیکبوونەوەی من لێی. من لە ژیانمدا هەرگیز ئەوەم بۆ هەڵنەکەتبوو، کە لە نزیکەوە پالەوانێکی یاری شەترەنج بناسم، ئێستاش هەرچەندە پتر بۆ ئەوە هەول دەدەم، کە ئەو تەرزە مرۆڤە بناسم، پتر ئەوەم بۆ ساخ دەبێتەوە، کە شتێکی دژوارە مرۆڤێك بێنیتە بەرچاوی خۆت، کە هەموو چالاکی مێشکی تەنها بریتی بێت، لە سووڕانەوە لە دەوری تەختۆکەیەکی شەستوچوار خانەی رەش وسپی. من لە ئەزموونی تایبەتییەوە شارەزای ئەوە بوویمە کە (یاری پاتشایان) هێزێکی راکێشانی نهێنیداری هەیەو، ئەوە تاکە یارییێکی ناو یارییەکانە کە لەژێردەسەلاتی مرۆڤ دایەو لە هەموو زۆرداری و تەلسمێکی رێکەوت ئازادەو، ئالای سەرکەوتنی تەنها لە بیرو بەهرەی ئەقل سەرهەڵدەدات. بەلام ئایا ئەگەر ناو لە شەترەنج بنێین یاری، هەندێك خۆمان تووشی گوناه ناکەین؟ ئایا شەترەنج زانست، یان هونەرێك نیە؟ کە لەسەر و کاتەگۆرییەکان وەستاوە، هەروەکو تابووتی موحەممەد لە نێوان ئاسمان و زەوی. پەیوەستییێکی بێ وێنەی جووتە دژ بەیەکەکانە، کۆنینەیەکی هەمیشە نوێیە، دەزگاییێکی میکانیکییە، بەلام خەیاڵ هەڵی دەسووڕێنێ، فۆرمێکی ئەندازەیی سنووورداری سەقامگیرە، بەلام بێ سنوور لە تەرزی کۆسازی، هەمیشە لە برەودایەو، هیچ بەرێکیشی نیە، بیرێکە بەرەو هیچ دەڕوا، ماتماتیکێکە هیچ

دەژمێرێ، هونەرێکی بێ کارە، بیناسازییێکی بێ کەرستەیە، هیچ شتێکی وا کەم نیە، کە لە بوون و مانەوەیدا لە هەموو کتێب و کارەکان نەمرترە، تاکە یارییێکە کە هی هەموو گەلانە، هی هەموو سەردەمانەو کەسیش نازانێت چ خوداییێك بۆ لەناوبردنی بێزاری و زاخاوی مێشك هێناویەتیە سەر زەوی، وریاکەرەوەی گیانە، هەموو مندالێك توانای فێربوونی رێسا سەرەتاییەکانی هەیەو دەزانێت سەرەتاو کۆتاییەکەی چۆنە، هەموو پاشکەوتوویێك دەتوانێت خۆی لە قەرە بدات، بەڵام لەو چوارگۆشە تەنگ و نەگۆڕە دەکرێت لێزانییێکی تایبەت بهێنرێتە ئارا، کەلەگەڵ هی تر لەبەراوردکردن نەییێت.

لێزانی وا کە تەنها بەهرەی تایبەتی شەترەنجیان هەبێت و بەس، بلیمەتی تایبەتمەند، کە لای ئەوان هێزی ئارامی و تەکنیك وەك دوو بەشی یەکسان کاریگەرییان هەیە، هەروەك لە ماتماتیك، لە هۆنراوە، لە موزیك، بەڵام لە چین و لە پەیوەستییێکی تردا، لە سەردەمە کۆنەکان لەوانەبوو سەودایی بەدوای زانستی سروشت وای لە بابایێك کردبایە، مێشکی بلیمەتێکی شەترەنج بخاتە بەر لێکۆلینەوەو توێکاری، بۆ ئە[illegible]زانێت کە ئایا پێچێکی تایبەت



لە بارستە بۆرەکەی مێشـحیدا [illegible]ـە ئارادا هەیە، ماسولکەیەکی تایبەت بە شەترەنجی تیایە؟ یان هەڵگرێکی چڕی شەترەنجی تیایە، کە لە کەللە سەرەکانی تردا نەبێت؟ باشە دەبێت باری بێ وێنەو تایبەتی میرکۆ چینتۆڤیچ چۆن ئەشق و سەودایی ئەو بابا سروشتناسەی بوروژاندبایە؟ چونکە ئەوبارێکی یەگجار تایبەت ونایاب و، رۆشنبیرییەکی بێ ئەملاو ئەولای سستی و تەوەزەلییە،

وەکو پارچە دەزوولەیەکی زێڕینە، کە لە ورگی تاشە بەردێکی کەڕولاڵدا بێت. لە ڕاستیدا شتەکە لای من تا ڕادەیەك رۆشن بوو، بلیمەتێکی ئاوایەکجارەو یەکلایەنەو تایبەت لە یاری، تەنها گابازێك دەئافرێنێ، بەڵام شتێکی نەکردەو دژوارە بتوانیت مرۆڤێکی ئاوا مێشك وروژاو بێنیتە بەرچاوی خۆت، کە لەلای ئەو، ئەو جیهانە هەموو بۆتە شەقامێکی تەسك و یەك ئاراستە لە نیوان ڕەش وسپی دا، کە لە چاوی هاتوچۆو پاش و پێشی رووتی سی ودوو داشەبەرددا بە دوای خۆشی ژیاندا دەگەڕێت، مرۆڤێك کە تەنها بەوەی لە دەستپێکی گەمەیەکی نوێ دا، لە جیاتی سەربازێك، ئەسپێك پێش دەخات، کارێکی مەزن ئەنجام دەدات و کونجی هەژارانەی خۆی لە گۆشەی تەختەی شەترەنجدا دەخاتە هەواری نەمری، مرۆڤێك، مرۆڤێکی خاوەن گیان، بە بێ ئەوەی ئەقلی تێکچووبێت، بە درێژایی دە، بیست، سی، چل ساڵان هەموو هەنگاوی بیرکردنەوەی هەمیشەوهەمیشە بریتی بێت لە ڕاونانی مەلیکێکی لە دار دروستکراو لە گۆشەیەکی شەترەنجەوە بۆ گۆشەییێکی تر.

ئێستاش ئەو دیاردەیە، ئ[illegible]مەتە تایبەتە، یان ئەو گێلە



مەتەڵئامێزە، ئەوا لەسەر پشتی هەمان کەشتی تەنها شەش کابینە لەمنی تەنها، دوورە، لە منی سەوداو مردووی شتە بیرییەکان، دەبێ توانای ئەوەم هەبێت، بتوانم خۆمی لێ نزیك بخەمەوە. دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە دۆزینەوەی فێلێك، فێلی ناماقول نا ماقول" بۆ نموونە: بە ناوی ئەوەی گوایە بۆ رۆژنامەیەکی گرنگ و بە ناوبانگ دێمانەیەکی لەگەڵدا ساز دەکەم! بەمەش ختووکەی لە

خۆبـاییی بوونەکـەی دەدەم، یـان تەماعگیرییەکـەی دەورووژێـنم بەوەی پێشنیاری پێشیبڕکێیەکی چەوری بۆ دەکەم لە سکۆتلەندا. بەڵام لە بەرەنجامدا گەیشتمە ئەو بیرەی، کەباشترین هونەری ڕاو ئەوەیـە، کـە وا بکـەی ئـەو کەلەشـێرە کێوییـەی کـە دەتـەوێ ڕاوی بکەیت، خۆی تووشی چەشتەبوون بێت، ئەویش بەوەی بیخەیتـە تەپکـەی ئـاوازی خوێنـدنی هاوڕەگـەزێکی خـۆی، جـا دەبێـت چ کاریگـەرتر بێـت، بـۆ راکێشـانی سـەرنجی پالـەوانێکی شـەترەنج، لەمەی پیاو بچێت خۆی لەبەر دەمی ئەودا دەستبکات بە یاری شەترەنج؟

من هـەرگیز لـە ژیانمـدا هونەمەرنـدێکی راسـتی یـاری شـەترەنج نەبوویمە، چونکە من یاری شـەترەنجم تـەنها بۆ کات بەسـەربردن بەکارهێناوە، ئەگەر سەعاتێك لەسەر تەختەی شەترەنج دانیشتبم، ئەوە قەت لەبەر ئـەوە نـەبووە مێشـکی خـۆم مانـدوو بکـەم، بەڵکوو بەپێچـەوانە بـۆ ئـەوە بـووە مێشـکی خـۆم لـە گـرژی و مانـدووبوون دوور بخەمەوە. من بە مانای وشە "گەمە" بە شـەترەنج دەکـەم، لـە کاتێکدا یاریکەرانی راستی شەترەنج، بە جیددی یاری شـەترەنج دەکـــەن و، بـــۆ پێناســـەیا[illegible]ەکـــە بـــوێرم وشـــەی نـــوێی (جیـددیکار)یـان بـۆ بخەمـە [illegible] فەرهـەنگی زمـان. دیـارە یـاری شـەترەنج وەکـو خۆشەویسـتی بـە تـەنها ناکرێـت و کەسـێکی تـری پێویستە. ئەوەشـم نـەدەزانی کـە لـەو ساتەوەختەدا ئایا کەسـێکی تری ئاشقە شەترەنج لەسەر پشتی کەشتییەکە هەیە یان نا. بۆ ئـەوەی ئەگـەر کەسـێکی ئـاوا هـەبێت، بتـوانم لـە ئەشـکەوتەکانیان راکێشی دەرەوەیان بکەم، داوێکی سادەم لـە ژووری جگەرەکێشـان



دانایەوە، بەوەی هەستام لەگەڵ ژنەکەم ، کە لەخۆم خراپتر سەری لـە شـەترەنج دەردەچـێت، وەکـو چـۆلەکەگرێك، لەسـەر تەختـەی شـەترەنج هـەڵکوڕکاین. جـا بەڕاسـتی هێشـتان شـەش بـەردمان نەجولانـدبوو، کـە یـەکێك بەدیارمانـەوە وەسـتا، کەسـێکی تـریش هـات و داوای کـرد، کـە ڕێگـای بـدەین تەماشـامان بکـات، تـا سـەرەنجام کەسێکی وا پەیـدابوو، لـەو تـەرزەی کە من چاوەڕوانم دەکرد، داوای کرد دەستێك یاری شەترەنجی لەگەڵدا بکەم. ئەو پیـاوە نـاوی (مێـك کۆنـەر)بـوو، ئەنـدازیارێکی سـکۆتلەندی، وەك بیستمەوە لە دروستکردنی بیرە نەوتیەکانی کالیفۆرنیا پارەیەکی چـاکی بەدەسـت کـەوتبوو. پیـاوێکی چوارشـانەی تێکچـەقیوی تەبـەش پـانی نزیکـە چوارگۆشـەیی، ددان گـەورەو رەنـگ تێـر، لـە سـوورایەتی دەموچـاوی وێ دەچـوو کـە بـەلای کـەم جـار و بـار تێروپـڕ تـامی وێسـکی کردبێـت. شـان و پیـل دەرپەڕاندنەکـەی لـە کـاتی یـاری کەسـایەتی ئـەو پیاوەی پێشـان دەدا، کە یەکێکـە لـەو تـەرزە کەسـانەی کـە بـێ ئـەملاو ئـەولا سـەرکەوتن هـەر بـە خۆیـان ڕەوا دەبینن، بە جۆرێك لە یارییێکی ئاوا کەم بایەخیش دۆڕاندن بە کەمبوونەوەی کەسایەتی خۆ[illegible]زانن و بێ هیچ رەچاوکردنێك خویـان بـەوە گرتـووە خۆیـان بسـەپێنن، خویـان بـە سـەرکەوتنی راستەقینە گرتووە. ئەو مرۆڤە خۆپێگەیێنە وا نقوومی بیرکردنەوە ببوو، هەموو قسەکردن، یان پـەرتکردنێکی خـەیال و بیرکردنـەوەی لـە کـاتی یـاری بـە خـەتا بگرە بـە سووکایەتی پـێ کـردن لـە قەلـەم دەدا. کـــە دەســـتی یەکـــەمی دۆڕانـــد، مرومۆچـــی دایگـــرت و، دکتاتۆرانـە رایگەیانـد، کـە هـۆی دۆڕاندنەکـەی ئـەوە بـووە چـەند

چرکەیەك خەیالی پەرت بوو، ئاگای لە یاری نەما. کە سێهەم دەستی دۆڕاند، خەتاکەی خستە مل هەراوهۆریای ژوورەکەی هاوسێ، ئیتر بەبێ داوای یارییێکی نوێ و تۆڵەکردنەوە، بەهیچ جۆرێك ئامادەنەبوو، دان بە دۆڕاندنەکەی دابنێت. لەسەرەتا خۆشییێکم لەو ململانێ توندەی وەردەگرت، بەڵام پاشان هەر لەبەر خاتری ئەو و بۆ مەبەستە تایبەتەکەی خۆم، واتە بە ئومێدی چەشتەکردنی چێنتۆڤیچی پالەوانی جیهانیی شەترەنج، یاریم لەگەڵدا دەکرد.

لە سێیەمین رۆژدا نیوە سەرکەوتنێکم بەدەستهێنا، ئەگەر لەسەر رووتەختی کەشتیەکەوە، لە پەنجەرەکانەوە، سەرنجی کەوتبێتە سەر ئێمە، یان هەر بە رێکەوت بوو بێت، چێنتۆڤیچ هاتە ژووری جگەرە کێشان، کە دیتی وا ئێمە خەریکی هونەرەکەی ئەوین، بێ دەستی خۆی، چەند هەنگاوێك لە ئێمە نزیك کەوتەوە، لە دوورەوە بە چاوێکی تاقیکردنەوە تەماشاییێکی تەختە شەترەنجەکەی کردین، ئەو کاتە نۆرەی مێك کۆنۆر بوو، دەبووایە بەردێك بجوولێنبێت، ئیتر ئەو جوولەیەی مێك کۆنۆر بەس بوو، بۆ ئەوەی چێنتۆڤ[illegible]ە بگات، کە گەمە نەزانانەکەی ئێمە، شایانی بایەخی وەستایانەی ئەو نیە. بە هەمان ئاکاری ئاسایی خۆی، رۆمانە جاسووسیەکەی دەستی، کە لە کتێبخانەکە بۆ تەماشاکردن خرابووە بەردەستتان، بێ ئەوەی تاقەپەڕێکی لێ هەڵبداتەوە، خستیەوە جێگەکەی خۆی و لە مێزەکەی ئێمە دوورکەوەتەوەو ژووری جگەرەکێشانی بەجێ هێشت. لە دڵی خۆم کەمێك بە بایەخ پێ نەدان و بە سووك تەماشاکردنەکەی، بە



سەرنجە سارد و سڕەکەی دلگیر بووم، بۆ ئەوەی وەك بڵێی دلگیریەکەم بەبا بدەم، بە مێك کۆنۆرم ووت: وەستا گەمەکەی تۆی بە دڵ نەبوو!، ووتی کام وەستا؟ ئیتر تێم گەیاند، کە ئەو کابرایەی تازە بەلاماندا تێ پەڕی و بە نیگاییێکی سووك تەماشای کردین، ئەوە چێنتۆڤیچ بوو، پالەوانی جیهانی شەترەنج! هەروەها پێم ووت: ئێمە هەردووکمان نیگا سووك و روح زلیەکەی فەرامۆش دەکەین، چونکە خەڵکی هەژار دەبێت چێشت بە ئاو لێ بنێن. قسە هێواشەکەی من کاریگەرییێکی چاوەڕوان نەکەراوی لە مێك کۆنۆر کرد، سوورهەڵگەڕاو گەمەکەی نێوان خۆمانی فەرامۆش کرد، مرۆڤ یەکسەر هەستی بەوە دەکرد، کە ئەو هیچ ئاگای لەوە نەبووە کە چینتۆڤیچ لەسەر پشتی ئەو کەشتەیەدایە، ئیتر بێ ئەملاو ئەولا دەیەویست بەرامبەر چێنتۆڤیچ یاری بکات. هەرگیز ئەو لە ژیانی خۆیدا یاری لە دژی پالەوانێکی جیهانی نەکردبوو، جگە لە تاکە جارێك، ئەویش لە یارییێکی بەکۆمەل ، کە ژمارەیان چل کەس بووە، دیارە ئەوسا خۆشییێکی زۆری لەم یاری وەرگرتبوو، دیارە ئەوەندەشی نەمابووە کە لە یارییەکە براوە بێت. لێی پرسیم:"تۆ لە نزیکەوە ئەو [illegible]انە دەناسیت؟" گوتم نا، لێی پرسیم:"دەتوانیت داوای لی بحەیت بێ بۆ لامان؟" بە پوازشی ئەوەی کە بە پێی زانیاری من چێنتۆڤیچ زۆر حەز لە تێکەڵاوی ناکات، داواکەیم رەتکردەوەو ووتم، جگە لەمەش چی هەیە وا لەپالەوانێکی جیهانیی بکات، بێت یاری لەگەڵ ئێمەی نەزان بکات؟

دیاره نه دەبووایه من وشەی "نەزان" بەرامبەر یەکێکی لەخۆڕازی وەکو مێك کۆنۆر بەکاربهێنم، به تووڕەیی خۆی له قسەکەی من بەری کرد و ووتی: چێنتۆڤیچ تکای پیاوێکی بەرێز ناگێڕێته دوواوەو ئەو خۆی خەمی ئەوەیان دەخوات. لەسەر ئارەزووی ئەو من به کورتی باسی کەسایەتی چێنتۆڤیچم بۆ کرد. ئیتر تەختەی شەترەنجەکەی خۆمانی فەرامۆش کرد و به هەڵپه بەرەو سەربانی کەشتییەکه به دوای چێنتۆڤیچدا چوو. من جارێکی تر هەستم بەوە کرد که ئەگەر شتێك پەڕییه کەللەی ئەو ناوشان پانه، ئەوا کەس ناتوانێت ڕێگای لیٚ بگرێت.

زۆر به تاسەوە چاوەڕوانم دەکرد، دوای ده خولەکێك مێك کۆنۆر گەڕایەوە، ، دیار بوو نەگەیشتبووە ئەنجامێکی دڵخواز. پرسیم: "چی بوو؟" کەمێك به پەستی وەڵامی دامەوە: "تۆ چۆنت گوت وابوو، پیاوێکی زۆر ڕێکوپێك نیه، پێم گوت هاتووم خۆمت پیٚ بناسێنم، هەر خۆشی له گوره نەبرد و دەستی تۆقەی بۆ درێژ نەکردم، ویستم ئەوەی بۆ ڕۆشن بکەمەوە، که شەرەفێکی گەورەیه بۆ ئێمەی سەر پشتی ئەو کەشتیەو شانازی پێوه دەکەین، ئەگەر جەنابیان یارییێکی به کۆمەڵمان له گەڵدا بکات. پشتی خۆی لیٚ کردم و ووتی، به داخەوه [illegible] ئاژانسەکەم پەیمانی ئەوەم ئیمزاکردوو، که بیٚ بەخشیس هیچ یارییێك نەکەم، کەمترین بەخشیشیش بۆ هەر یارییێك دوو سەت و پەنجا دۆلاره"

پێکەنیم و وتم، من هەرگیز بیرم بۆ ئەوه نەچوو بوو، پاڵدانی چەند داشه بەردێك له ڕەشەوە بۆ سپی، ئاوا بازرگانییێکی بەهادار بێت، ئەوجا هیوادارم تۆش وەك من به هێمنی ئێره جیٚ بهێلیت.



بەڵام دیاربوو مێك کۆنۆر شتەکەی زۆر به تۆخی وەرگرتبوو: "لەگەڵی ڕێکەوتم! بەیانی دوای نیوەڕۆ، کاتژمێر سیٚ یاری لەگەڵدا دەکەم، لێره له هۆلی جگەرەکێشان، هیوادارم ڕێگانەدەین پشتمان له ئەرز دات ". له قوڵایی دڵمەوه لێم پرسی:

- چۆن؟! تۆ دوو سەت و پەنجا دۆلاری دەدەیتیٚ

- بۆچی نا؟مافی ڕەوای خۆیەتی. ئەگەر تووشی ددانهێشه ببم و به ڕێکەوت پزیشکێکی ددان لەسەر پشتی ئەو کەشتیەدا بێت، ناتوانم داوای ئەوەی لیٚ بکەم به خۆڕایی ددانم بۆ دەربێنیٚ، ئەو پیاوەش مافی خۆیەتی که داوای پاداشتێکی چەور بکات، له هەموو مەیدانەکاندا وەستاو پسپۆڕەکان باشترین بازرگانن، به دیدی منیش بازرگانی چەند ئاشکراو راشکاو بێت، ئەوەنده باشتره. من پارەیەکی رووتی بدەمیٚ باشتره لەوەی ئەو بەزەیی پێمدا بێتەوەو، پاشانیش ناچاری ئەوه ببم، سوپاسی بکەم، له لایێکی تر من له یانەکەی خۆماندا، له شەوێکدا پتر لەو پارەیەم دۆڕاندووه، بیٚ ئەوەی پالەوانێکی جیهانی یاری لەگەڵدا کردبم. بۆ ئێمەی (نەزان) شەرم نیه، چینتۆڤیچ لێمان بباتەوه!

شایانی سەرنجه، لام سەیر بوو، چەند وشه بیٚ گوناهەکەی من (ئێمەی یاریکەری نەزان) [illegible]اریگەری لیٚ کردبوو، بەڵام سەبارەت بەوەی، ئەو گاڵتەیەی من زۆر لەسەر ئەو وەستا بوو، من له دژی تەوسەکەی ئەودا قسەیەکم نەبوو بیکەم، خۆ لەلایێکی تر به هۆی ئەو له چینتۆڤیچی عەتیکەم نزیك دەبوومەوه. ئێمه به زوویی چوار پێنج پیاوی ترمان لەو پێشبڕکێیه ئاگادارکردەوه، که هەموویان پێشتر خۆیان وەك ئەهلی شەترەنج پیٚ ناساندبووین.

وە بۆ ئەوەی هاتوچۆی کەسانی تر کەمتر کاریگەری لە یارییەکەمان بکەن، مێزەکانی دەوروبەریشمان بۆ خۆمان داگیرکرت.

رۆژی دواتر لە کاتی دیارکراو، گروپەکەمان هەموو کۆبووینەوە، دیارە شوێنی ناوەڕاست بەرامبەر پالەوانی گەورە بۆ جەنابی مێك کۆنۆر تەرخان کرا. مێك کۆنۆر زوو زوو تەماشای سەعاتەکەی دەکرد و بۆ هێمن کردنەوەی دەروونی خۆی، جگەرە دوای جگەرەی دادەگیرساند. بەڵام بە پێی ئەو زانیاریانەی کە من لە هاوڕێکەی خۆم وەرم گرتبوو، دەمزانی کە پالەوان هەمیشە وا دەکات، خەڵك دە دەقیقەیەك چاوەڕوانی بکەن، بەوەش قورسایی و بایەخی خۆی پێشانی خەڵك دەدات. پاشان دەرکەوت، بە ئارامی و لەسەرەخۆ لە مێزەکە نزیك کەوتەوە، بێ ئەوەی خۆی بناسێنێ:"ئێوە دەزانن من کێم و، ئێوەش کێن بۆمن گرنگ نیە!" دوای ئەو قسە بێ شەرمەی دەستی کرد، بە وشکی رێساکانی یاریەکی رۆشن کردەوە، لەبەر ئەوەی بەشی پێویست تەختەشەترەنج لە ئارادا نەبوو، پێشنیاری کرد کە ئێمە هەموو دژی ئەو یاری بکەین، لە [illegible] جولاندنی هەر بەردێك، ئەو دەچێتە سەر ئەو مێزەی ئەوەتر، بۆ ئەوەی ئەو کاریگەری لە راوێژی نێوان ئێمە نەکات، دوای ئەوەی ئێمە بەردی خۆمان جولاند، بە داخەوە بە هۆی نەبوونی زەنگوڵەی یاری، دەبوایە بە کەوچکێك لە شووشەیەکی خاڵی بدەین، هەروەها پێشنیاری کرد کە ماوەی بیرکردنەوە دە خوولەکە، ئەگەر ئێمە پێشنیارێکی ترمان نەبێت. دیارە ئێمەش وەك کۆمەڵە قوتابییێکی شەرمن



هەموو پێشنیارەکانیمان قەبووڵ کرد. لە دابەشکردنی ڕەنگەکان ڕەش بەر چێنتۆڤیچ کەوت" هەر بە پێوە بەردی یەکەمی خۆی جولاندو چووە سەر مێزەکەی ئەولا تر، کە خۆی وەك شوێنی چاوەڕوانی پێشنیاری کردبوو. لەوێش بە ئارامی دانیشت و دەستی کرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤارێکی وێنەدار.

ئەوە ناهێنێت باسی ئەو یارییە بکەین، وا کۆتایی هات، وەك دەبووایە وا کۆتایی بێت، بە بەزینێکی خراپی ئێمە، لە بیستودووەمین جوولەی بەردەکانمان. دیارە شتێکی سەیر نیە، پالەوانێکی جیهانی نیو دەستە یاریکەری ناوەندی و خوارەوەی ناوەندی ببەزێنێ. بەڵام ئەوەی شتەکەی بۆ ئێمە ناخۆش کردبوو، تەوس و لە خۆبایی بوونی چێنتۆڤیچ بوو، وای دەکرد کە ئێمە هەست بەوە بکەین، کە ئەو بە دەستی چەپی ئێمەی بەزاندووە، هەرجارێك کە بەردێکی دەجوولاند، وەك فیشەکە شێتە بەخێرایی تەماشای تەختەشەترەنجەکەی دەکرد و بەردەکەی پەلاردەکرد و دەگەڕاوە جێگەکەی خۆی. وەك ئەوەی ئێمە خۆمان بەردەدارینەکانی شەترەنج بین، بە بزووتنەوەکەی ئەو، بێ دەستی خۆت دیمەنی پیاوێکت دە[illegible] بەرچاو، کە پارچەنان یان پەڵەگۆشتێك فڕێ بداتە بەردەم سەگێکی بەرەڵلا. خۆ ئەگەر کەسێکی هەست ناسك بووایە، بە باوەڕی من جار بە جار سەرنجی ئێمەی بۆ هەڵەکانمان ڕادەکێشا، یان بە وشەی دۆستانە ورەی بەرز دەکردینەوە. بەڵام دوای ئەوەی وشەی "کش مەلیك"ی لەدەم دەرچوو، ئەو ڕەبۆتە نامرۆڤەی شەترەنج، وەك تەنێکی وشك لەبەردەم مێزەکە چاوەڕوانی ئەوەی کرد، کە ئایا ئێمە

ئامادەین، یارییێکی تری لەگەڵدا بکەین. من هەستامەوە، وەك هەموو ئەو کاتانەی کە مرۆڤ ڕووبەڕووی ئاڵۆزییەك دەبێت، بە دەست جوڵاندن ئاماژەی ئەوەم بۆ کرد، کە ئیتر بەو بەزینەمان و لەو بازرگانی دۆلارە، بەلای کەمەوە لە لایەن منەوە، ئیتر ناسیاویمان کۆتایی هات، بەڵام دیتم پێچەوانەی ویستی من، بە دەنگێکی کەرخ، مێك کۆنۆر ووتی: "بەڵێ ئامادەین!"

لەو سینگدەرپەڕاندن و ئامادەباشییەی مێك کۆنۆر من ترسم هاتێ، بەراستی لەو ساتەوەختەدا پتر بە یاریکەرێکی بۆکسییێن دەچوو، کە خەریك بێت دەست بە هاویشتنی مستەکۆلە بکات، نەك پیاوێکی رێزدار وجوامێر. ئەگەر رەفتاری نامـاقوڵی چێنتۆڤیچ بوو، یان ویست وئارەزووی وروژاوی خۆی، میك کۆنۆری بە تەواوی گۆڕی بوو. دەموچاوی تا ترۆپکی تەوێڵی سوور هەڵگەڕابوو، کونەلووتەکانی کراوەو هەڵمسابوون، لێوەکانی خۆی بە توندی دەکرۆشت، دەموچاو وچەناگەی دەتگوت بۆ جەنگ گرژ هەڵگەڕاوە. چاوەکانی زەق ببوونەوە، وەك چاوی ئەو کەسانەی کە لە یاری رۆلێتدا دوای شەشەمین جارو حەوتەمین جاری جومکەیاری رەنگی [illegible] ژێردراویان بۆ دەرناچێت. لە تررووکەی چاوەکانی تێگەیشتم، حە ئەوە کەسێکی وا توندگرە، کە ئامادەیە تەواوی سامانی خۆی خەرجی یاری بکات لەگەڵ

چێنتۆڤیچ، هەر یاری بکات و یاری بکات و دووبارەی بکاتەوە، تا ئەو کاتەی بەلای کەم بۆ تاقەجارێکیش براوە دەبێت. ئەگەر چێنتۆڤیچ سەبری هەبێت، ئەوە کانە زێڕێکی کەوتۆتە بەر دەست



و تا دەگاتە بۆینۆس ئایرس چەند هەزار دۆلارێکی لێ دەردەهێنێ.

چێنتۆڤیچ لە شوێنی خۆی جووڵەی نەکرد، بە رێزەوە وەڵامی دایەوە: فەرموون، ئەو جارە ڕەش هی ئێوەیە!

یاری دووەمیش گۆڕانێکی تێدا نەبوو، ئەوە نەبێت چەند کەسێکی تر هاتبوونە رێزی تەماشاچیان، ئەوەش ئاو و هەوای گەمەکەی سەرنجڕاکێش و گەرمتر کردبوو. مێك کۆنۆر هێندە بە قووڵی لە تەماشای تەختەشەترەنجەکە ڕۆچوو بوو، دەتگوت نیازی وایە بەردی شەترەنجەکان هویپۆتێنێزە و ئەفسوناوی بکات بۆ خۆی بیانباتەوە. من هەستم بەوە کرد، کە ئامادەیی ئەوەی تێدایە بۆ چێژی دەربڕینی تاقە (کش مەلیك)ێك دژی دژە دەمساردەکەی هەزار دۆلار خەرج بکات. ئەوەی عەنتیکە بوو ئەوە بوو، بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین، هەندێك لە وروژانە توند و تیژەکەی پەڕی بووە ئێمەش. جولاندنی هەر بەردێك وەکو ئەوەی لەوەوپێشتر دانوستاندنی گەرمی لەسەر دەکرا، هەمیشە لە دوایین چرکەی پێش جوڵەکان یەکێك رێگای بەوانەی تر دەگرت، تا هەموو هاوڕا دەبووین ئەو [illegible] ماژەمان دەدا بە چێنتۆڤیچ

بگەڕێتەوە سەر مێزەکە. وردە وردە گەیاندمانە سی و حەفتەمین جوولەو، وەك شتێکی زۆر چاوەڕواننەکراو یارییێکە گەیشتبووە بارێك کە لە بەرژەوەندی ئێمەدا خۆی دەنواند، چونکە توانیبوومان سەربازێك بە سەلامەتی بگەیەنینە خانەی C2 ی خانەی پێشکۆتایی هێلی C، هەرئەوەندەمان مابوو پاڵێکی پێوە بنێین و بیخەینە سەر خانەی C1و بیکەین بە وەزیرێکی نوێ. بەڵام

لەوەش دڵنیا نەبووین کە بەئازایی‌خۆمان بوو یان نا گەیشتبووینە ئەو شانسە، وە سۆسەی ئەوەمان دەکرد کە ئەو بارە لەبارەی بۆمان هەڵکەوتووە لە چێنتۆڤیچەوە سەری هەڵداوە، چونکە ئەو بەهرەی ئەوەی هەبوو کە زۆر لە پێشتر بەرەنجامەکانی یاری بخوێنێتەوە، بۆیە ترسی ئەوەمان هەبوو کە تەپکەیەکی بۆ دانابینەوەو، نەخشەی ئەوەی دانابێت بمانکات بە چەشەی چەنگاڵی خۆی. لەگەڵ ئەوەش، دوای دانوستاندنێکی زۆر ولیَ وردبوونەوەیەکی پشکنەرانە گەیشتینە دوا لێواری بیرکردنەوەو بڕیارمان دا سەربازەکەمان بەرەو پێشەوە بەرین. مێك کۆنۆر دەستی خستە سەر سەربازەکەو خەریك بوو بەرەو پێشەوە بۆ دوا خانە بیبزێویَ، لەو کاتەدا بوو دەستێك خۆی لە قۆڵی گیرکردوو دەنگێکی وروژاو بە خامۆشی چرپاندی: لە ڕاهی خوا نەکەی!

بیَ دەستی خۆمان هەموو رووی خۆمان لە خاوەنی ئەو دەنگە کرد، پیاوێکی تەمەن نزیکە چلوپێنج ساڵەی دەموچاو باریك و تیژ، پێشتر کاتیَ لەسەر رۆخی بانەکەی سەرەوە وەستا بوو، بە هۆی دەموچاوە وەك تەباشیر سپی هەڵگەڕاوەکەی، سەرنجی منی بۆخۆی ڕاکێشا بوو، دەبێت لەو چەند خولەکەی دوایی هاتبێتە لای ئێمە، بە تەنگەتاوی تەماشای ئێمەی کردو لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:"ئێستا ئەگەر ... و سەربازە بکەیتە وەزیر، ئەوا



ئەو یەکسەر بە فیلی C1 ـەںوی دەبات، تۆش ئەسپەکەت دەگێڕیتەوە، بەڵام ئەو سەربازە ئازادەکەی دەباتە سەر D7 و هەڕەشە لە قەڵاتەکەت دەکات، ئەگەریش تۆ بە هۆی ئەسپەکەت کش مەلیکێك بکەیت، ئەوا دوای نۆ تا دە جوولە تۆ دەفەوتێیت،

ئەو بارە هەڵکەوتووەی ئێوە وەکوو ئەو بارەیە کە لەیاری ساڵی 1922ی (ئالیێخین) بەرامبەر (بۆگۆلیوبوۆف) لە شاری (پێستیانەر)ی بەریتانیای مەزن هاتە پێشەوە.

مێك کۆنۆر بە حەپەساوی دەستی لە سەربازەکە هەڵگرت، ئەویش هەروەکو ئێمە بە چاوێکی حەپەساو تەماشای کابرای کرد، کە دەتگوت خدری زیندەیە لە ناکاو دەرکەوتووەو هاتۆتە هانامان. دیارە ئەگە یەکێك بتوانێت پێشبینی سەرەنجامی نۆ جوولەی داهاتووی یاری شەترەنج بکات، دەبێت ئەوە پسپۆرێکی پلەی یەك بێت، لەوانەشە هەر پاڵەوانێکی جیهانی بێت و، بۆ هەمان یاری پاڵەوانی جیهانی سەفەر بکات. پەیدابوونی ئەو کەسە وەك فریشتەی ئاسمان وا لە ناکاو و لەو چاوتروکە ناسکەدا شتێکی هێندێك ناسروشتی بوو. مێك کۆنۆر لیَ پرسی:

- ئەدی ئێوە ئەگەر بتانەویَ پێشنیاری چی دەکەن؟!

- جاری لە سەربازەکە گەڕیَ و مەیبەرە پێشەوە! پاتشاکەت لە هێلی مەترسی G8ەوە بەرە سەر H7. ئەوسا لەوانەیە ئەو لە لاکەی تر شالاوت بۆ بێنیَ، بەڵام تۆ بە جوولەی قەڵاتەکەت لە C4ەوە بۆ سەر C8 رێگای پیَ دەگریت، لەوە ئەو دوو فیل وئەسپێکی لە دەست دەچێت، پاشان کاتی بیرکردنەوە دێت، ئەگەر بە ڕاستی و بیَ هەڵە، بە شێوەیەکی ... کەرانە ڕەفتار بکەن، ئەوسا دەتوانرێت بەرامبەر بن، پتر لەمە ںومێد نیە"

ئێمە هەموو بە جارێك لەو لێکدانەوە ورد و خێرایە حەپەسابووین، زنجیرەی هەنگاوەکانی وا باس دەکرد، هەر دەتگوت لە کتێبێکەوە دەیانخوێنێتەوە. ئێمە لە سایەی

ئامۆژگارییەکانی ئەو لەو یارییە بەرامبەر پاڵەوانێکی جیهانی کەس لە کەس دەردەچووین، ئەو شانسە دەرك پێ نەبراوە بۆ ئێمە شتێکی کەم نەبوو، بەرەنجامێکی تەلیسماوی بوو. هەموو بە هاودەنگی خۆمان کێشایە کەنار، تا ئەو بتوانێت باشتر تەختەی شەترەنجەکە ببینێت، جارێکی تر مێك کۆنۆر پرسی:

- واتە پاتشاکەم لە G8 بەرمە سەر H7 ؟
- بەڵێ، ئەمەیان بەر لە هەموو شتێك!

مێك کۆنۆر ئەمەی کرد و ئێمەش زەنگمان لە شووشەکەوە هێنا. چێنتۆڤیچ بە هەنگاوی ئاسایی خۆی ئازایانە هاتەوە سەر مێزەکەو بە چاوتروکانێك بەردی خۆی جولاند، لە لاباڵی پاتشاوە سەربازەکەی لە H2 ەوە بردە سەر H4، تەواو وەك ئەوەی فریادڕەسە نەناسراوەکەمان پێشبینی کردبوو. ئەوسا هاریکارەکەمان بە چرپەوە ووتی:

- دەی ئەوجا قەڵاتەکە، قەڵاتەکەت لە C8 ببە سەر C4 ، ئەوسا ئەو بەناچاری سەربازەکەی دەپارێزێ، بەڵام ئەوەشی بە هاناوە نایێت، تۆ لێی دەسرەوێنی! بێ ئەوەی ترست لە سەربازەکەی ئەو هەبێت، بە ئەسپەکەت لە d3–ەوە بۆ سەر E5 دەبەیت، ئەوسا هاوسەنگی لە نێوانتان دێتە کایەوە، ئەوساش لە جیاتی بەرگری، بەرەو پێشەوە دەچیت!.

ئێمە لە مەبەستی ئەو نەدەحەییشتین، ئەوەی ئەو دەیگوت بۆ ئێمە وەك زمانی چینی وا بوو. ئەوسا مێك کۆنۆر دەستی بە جووڵان کرد، وەك چۆن ئەو پیاوە پێشنیاری کرد، جارێکی تر زەنگمان لە شووشەوە هێنا، تا چێنتۆڤیچ بگەڕێتەوە. ئەوە جاری



یەکەم بوو، کە چێنتۆڤیچ یەکسەر بە خێرایی بڕیاری نەدا، بەڵکوو بە گرژییەوە تەماشای تەختەی شەترەنجەکەی کردو، بە ناچاری سەربازەکەی خۆی پاڵپێوەنا، کتومت ئەوەی هەڵبژارد کە پیاوە نامۆکە بە ئێمەی راگەیاندبوو، چێنتۆڤیچ ویستی بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، دوای یەکەمین هەنگاو، شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا، ئەویش ئەوە بوو چێنتۆڤیچ سەری خۆی بەرزکردەوەو تەماشاییێکی ورد و پشکنەرانەی ئێمەی کرد، دیار بوو دەیویست بزانێت، ئەو کەسە کێیە کە ئاوا بەرگری پێشان دەدات؟

لەو ساتەوەڕا ئێمە مەراقمان پتر ببوو، تا ئێستا بەبێ ئەوەی هیواییێکی جیددیمان بەسەرکەوتن هەبێت یاریمان دەکرد، بەڵام ئێستا کەوتبووینە بیری ئەوەی، کە مل بە چێنتۆڤیچی لە خۆبایی کەچ بکەین و لووتە بەرزەکەی نەوی کەین، تەزوویێکی گەرم بە دەمارەکانماندا دەهات. هاریکارەکەمان نەخشەی هەنگاوی داهاتووی بۆ ئامادەکردین، منیش ئەو کاتەی زەنگم لە شووشەکەوە دەهێنا، پەنجەکانم دەلەرزین. ئیتر یەکەمین بەزم و خۆشیمان نزیك کەوتبووەوە. چێنتۆڤیچ کە تا ئەوسا هەر بە پێوە یاری دەکرد، ئەو جارەیان کەوتە بیرکردنەوە، بیری کردەوە، بیری کردەوە، پاشان بە گرانیو بە هێواشی لەسەر کورسییەکی دانیشت. ئەو کاتەی لەسـ [illegible] بەرەو خوارەوە بە ستوونی دانیشت، جێگەی جەستەکەی تەنگ بوو لە نێوان ئێمەدا، ئێمە ناچارمان کرد کە مێك خۆی تەسك بکاتەوەو خۆی بخێوێنێتە نێوانمان. بەبێ جووڵە چاوی خۆی شۆڕکردەوە سەر تەختەکە، زۆربیری کردەوە، بە شێوەیەك بیلبیلەکانی چاوی بە ئاستەم

دەدیترا، دوای بیرکردنەوەیەکی خەست و سەخت دەمی خۆی
والاکردەوە، بەوەش هەندێك دەموچاوە خڕیلە گرژەکەی
خاوبووەوە. چەند دەقیقەیەکی تر بیری کردەوەو ئەوجا بەردێکی
جولاند و هەستایەوە سەر پێیان. هاریکارەکەمان چرپاندی:

- بیری لە جوولەیەکی کەمینگرانەی چاك! کردۆتەوە، بەڵام تێی ناکەوین، ڕێگاکەمان دەگۆڕین، پێویستە بیگۆڕین، ئەوسا دەتوانین بەرامبەر ببین و هیچ خودابیێکیش ناتوانێت بە هانایەوە بێت!

مێك کۆنۆر هەر گوێی گرتبوو و گوێڕایەلی دەکرد، ئیتر جووڵەکانی دوایی ئێرەو ئەوییێەکی زۆری بۆ ئێمە نادیاری ویست، ئێمە ئەوانەی تر لە مێژ بوو دابەزی بووین، دوای نزیکەی حەوت جووڵە، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر چێنتۆڤیچ رایگەیاند: بەرامبەر!

کپی و حەپەسانێکی تەواو باڵی بەسەر هەمووانـدا کێشا. لە ناکاوێك خشەشی گۆڕینی شەپۆلەکانی رادیۆو دەنگی موزیك هاتە گوێ، تەنانەت مرۆڤ گوێی لە تەپەی پێی کەسەکانی بانی سەرەوە دەبوو، لە دەرزی پەنجەرەکانەوە ویزەی کزە بایەکیش دەبیسترا. کەس لە ئێمە هەن[illegible] هەڵنەدەکێشا. ئەمە ڕووداوێکی



زۆر کتوپڕ بوو، هێشتان ئێمە بە باری حەپەسان بووین بەرامبەر ئەوڕووداوە چاوەڕواننەکراوە، لەوەی ئەو پیاوە نەناسراوە، لەیاریێکی نیوە دۆڕاوەوە توانی نەخشەی خۆی بەسەر ئەو پالەوانە جیهانییە بسەپێنێ. مێك کۆنۆر پشتی خۆی خستە سەر پشتگری کورسییەکەو، هەناسە تا ئێستا ڕاگرتووەکەی خۆی

لەگەڵ ئاهێکی بیستراو بەرەڵلا کرد. من چاودێری چێنتۆڤیچیشم دەکرد، کە چۆن لە دوا جوولەی بەردەکانییەوە ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو. بەڵام بەسەرخۆی نەهێناو، هەوڵی ئەوەی دا خۆی ئاسایی پێشانبدات و لەو کاتەی بەردەکانی بە ئارامی دەخستەوە سەر تەختەکە، بە هەمان ئازایی پرسی: "ئاغایان دەخوازن دەستی سێهەمیش وازی بکەین؟"

ئەو زۆر بابەتانەو سەوداکارانە ئەو پرسیارەی کرد. بەڵام ئەوەی جێی سەرنج بوو ئەوە بوو، لە کاتی پرسکردنەکەی بە هیچ جۆرێك تەماشای مێك کۆنۆری نەدەکرد، بەڵکوو چاوەکانی بڕیبووە سەر رزگارکەرەکەمان. وەکو ئەسپێکی ژێر پێ قایمی سوارێکی نوێ و باشتر، دەستنیشانی دژە راستەقینەکەی خۆی کردبوو. ئێمە بێ دەسەڵات و بە مەراقەوە تەماشای چاوی کابرای نامۆمان دەکرد. بەڵام بەر لەوەی ئەو پیاوە غەریبە بیرێك بکاتەوە، یان وەڵامێك بداتەوە، مێك کۆنۆر بەتەماحی سەرکەوتنی پتر، بە هەڵچوون و شاگەشکەییەکی زۆر هاتە وەڵام:

"بێ گومان! ئەمجارەیان دەبێ جەنابتان بە تەنها دژی ئەم یاری بکەن! جەنابتان تەن بە تەن دژی چێنتۆڤیچ!"

بەڵام شتێکی پێشبینی نەک[illegible]وما. ئەو پیاوە غەریبە کە تا



ئەو کاتەش بە شێوەیێکی سەرنجڕاکێش لە تەختە شەترەنجەکە ورد ببووەوە، ڕاپەڕی، کە دیتی هەموو چاوەکان بە مەراقەوە تەماشای ئەو دەکەن، بە پەشۆکاوی و پچڕ پچڕ ووتی:

"بە هیچ شێوەیەك! بەڕێزان...ئەوە شتێکە نەکراوەو نابێت...من هی ئەوە نیم...بیست ساڵە! نا بیست و پێنج ساڵە من لەسەر هیچ

تەختەیەکی شەترەنج دانەنیشتووم و، ئێستا دەبینم کە چەند سەرپێچیم کردووە، بەبێ وەرگرتنی ئیزن، خۆم لە یارییەکەی ئێوە هەڵقورتاند، تکاتان لێ دەکەم لێم ببوورن، لەوەی بەزۆر خۆم تێکەڵی کاری ئێوە کرد...بێگومان چیتر موزاحمتان نابم!" بەر لەوەی دەرفەتی ئەوەمان هەبێت، لەو کاردانەوە کتوپڕە حالی ببین، کشاوە دواوەو هۆڵەکەی بەجێهێشت.

مێك کۆنۆر مشتێکی بەهێزی بە مێزەکە داداو بە دەنگێکی بڵند هاواری کرد:"ئاخر ئەوە شتێکەو ئەقل نایگرێت، بیستوپێنج ساڵ ئەو پیاوە یاری شەترەنجی نەکردبێت! خۆ ئەو لە جوولاندنی هەر بەردێکدا، پێنج شەش هەنگاوی بەرامبەرەکەی پێشبینی دەکرد. کەس لە خۆڕا ئەوە ناتوانێ، ئەوە شتێکی نەکراو و نەکردەیە، ئەدی وا نیە؟!"

بێ دەستی خۆی لە دوا ووشەکانی پرسیارەکەی، ڕووی خۆی لە چێنتۆڤیچ کردبوو، بەڵام پالەوانی جیهانی وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێت، لە شوێنی خۆی نەبزووت:

"من ناتوانم هیچ حوکمێك لەسەر ئەوە بدەم، بەڵام یارییێکی نائاسایی و باشی کرد، هەر لەبەر ئەوەش من مەبەستی ئەوەم هەبوو شانسێکی تری بد[...]" ئەمەی گوت و لەسەرەخۆ لە شوێنی خۆی هەستایەوە سەر پییان و بە شێوەی ئاسایی خۆی ووتی:"ئەگەریش بەیانی جەنابی، یان جەنابتان ئارەزووی دەستێکی تر یاریتان هەبێت، ئەوا من کاتژمێر سێ لێرەم"

ئێمە نەمانتوانی زەردەخەنەی خۆمان بشارینەوە. چونکە هەر یەکێك لە ئێمە دەیزانی، کە چێنتۆڤیچ لە ئازایەتی نەبوو ئەو



شانسەی بە هاریکارەکەمان دەدا، قسەکانەشی، هەڵاتنێکی زەق بوو بۆ ئەوەی بەزینەکەی خۆی پێ دیزە بەدەرخۆنە بکات. ئیتر ئەوەندەی تر ئێمە مەراقمان کەوتە سەر ئەوەی کە بەچاوی خۆمان شکانی لووتێکی وا بڵند ببینین. لە پڕێکدا ئەندێشەی ئەوەمان بۆ هات، کە وا دانیشتووی کپ و ئارامی سەر کەشتییەکە هەموو لە دەوری ئێمەدا کۆبوونەتەوەو سەیری خۆشیی ئەو گەمە نائاساییە دەکەن...خەیاڵی ئەوەی ئەگەر بێت و لەسەر پشتی ئەو کەشتیەی ئێمەداو لە ناوەندی دەریادا تاجی پالەوانی لە یاریکەرێکی جیهانی بسەندرێتەوە، ئەوا ئەو رێکۆردە چۆن بە تەلەگراف وەك بروسکە دەگاتە هەموو جیهان، ئەوە خەیاڵێکی خۆشیبەخش بوو، ئەو خەیاڵە زۆر هانی ئێمەی دەدا بگەین بەو مەبەستە. لەلاییێکی تر ئەو یاریکەرە سەیر و چاوەڕواننەکراوە، ئەو فریاڕەسەی کە لە چاوتروکانێکی زۆر ناسکدا بە هانای ئێمەوە هات، کەسایەتییێکی تەواو پێچەوانەی چێنتۆڤیچ، مرۆڤێکی خاکی و روح سووك، باوەڕبەخۆ و زانا، ئەرێ ئەو پیاوە غەریبە کێیە؟! ئایا ئەمە بلیمەتێکی یاری شەترەنجەو ئەمڕۆ بە رێکەوت دەرکەوت؟ یان پالەوانێکی جیهانی بەناوبانگەو لەبەر هۆییێکی نەزانراو خۆی شاردۆتەوە؟ ئیتر زۆر بە گە[...]ە دانوستاندنمان لەسەر ئەو پرسانە دەکرد، هەرچۆنی لێمان دەدایەوەو دەمان هێناو دەمان برد، نەماندەتوانی هاودەنگی لە نێوان ترسە مەتەڵدارەکەی یان پێلێنانە کتوپڕەکەی و، هونەرە بەرزەکەی لە یاری شەترەنج بدۆزینەوە. بەڵام هەمووومان لەسەر ئەو خاڵە یەکڕا بووین: بە هیچ جۆرێك واز لە شانۆی یارییێکی تر ناهێنین. بڕیارمان دا هەموو

هەولێك بدەین بۆ رازیکردنی هاریکارەکەمان تا بۆ رۆژی دوایی دژی چێنتۆڤیچ دەستێکی تر یاری بکات. مێك کۆنۆر ئامادەیی خۆی پێشان دا، کە لە دۆڕاندندا ئەو زیانی دارایی بگرێتە ئەستۆی خۆی. ئەوە بوو لە ئەنجامی پرسیار لە ستیواردەکانی کەشتی بۆمان ئاشکرا بوو، کە ئەو پیاوە نەناسراوە خەڵکی نەمسایە، جا سەبارەت بەوەی منیش هاووڵاتی ئەو بووم، ئەو ئەرکە ڕووبەڕووی من کرایەوە.

ئەو پیاوە کە بە پەلە لەدەستمان ڕایکردبوو، زۆری نەویست لەسەر بانی کەشتییەکە دۆزیمەوە. لەسەر قەرەوێلەیەك پاڵکەوتبوو، خەریکی خوێندنەوە بوو، بەر لەوەی بچم بۆ لای، لە دوورەوە توانیم سەرنجی ئەوە بدەم، کە سەرە زۆر کورت تاشراوەکەی بە شێوەیەك خستبووە سەر سەرین، کە خەستەیی پێوە دیار بوو، دەموچاوە سپی داگەڕاوەکەی، کە هێشتا گەنجی پێوە دیار بوو، سەرنجی راکێشام، قژە زۆر سپییەکەی کەناری لا هەنیەکانی داپۆشیبوو. نازانم بۆچی بیری ئەوەم بۆ هات، کە هەبێ و نەبێ، دەبێ ئەو پیاوە کوتوپڕ لە ناکاوێکدا پیر بووبێت. هێشتان بە تەواوی نەگەیشتبوومە لای، بە رێزەوە لەبەرم هەستایەوەو خۆی پێناساند ،کەی لە گوێم ئاشنا بوو، ئەو



ناوە ناوی بنەماڵەیەکی پلە بەرزی نەمساوی بوو. هاتەوە بیرم کە یەکێك لەو کەسانەی هەمان ناوی فامیلی هەبوو، سەر بەبازنەکەی دۆستانی (شوبەرت) بوو، هەروەها پزیشکی تایبەتی قەیسەری پێشووتریش لەم بنەماڵەیە بوو. کاتێ من داخوازییەکەی خۆمانم بە (دکتۆر بی) ڕاگەیاند، کە پێمانخۆشە بەیانی بەرامبەر

چێنتۆڤیچ یاری بکات. یەکسەر پەشۆکا. گوتی ئەو بە هیچ شێوەیەك نەیزانیوە کە ئەوەی دوێنێ ئەو دژی یاری کردووە، پاڵەوانێکی جیهانی بووەو، سەرکەوتووترین و بەناوبانگترین یاریکارانی ئێستای شەترەنجە. لەبەر هەر هۆییێك بوو بێت، ئەو هەواڵە کاریگەرییێکی تایبەتی لێ کرد، چونکە هەمیشە دووبارە پرسیاری ئەوەی دەکرد، کە ئایا من دڵنیام لەوەی کە بەرامبەرەکەی بەراستی پاڵەوانێکی دانپیانراوی جیهانییە. من زوو هەستم بەوە کرد کە ئەمە جێبەجێبوونی ئەرکەکەمی بۆ ئاسانتر کردووم، بۆیەشە بەرامبەر هەستی ناسکی ئەو، وام بەباش زانی کە باسی ئەوە نەکەم، مێك کۆنۆر زیانی دارایی دۆڕاندن دەگرێتە ئەستۆی خۆی. لە دوای خۆکێشانەوەییێکی زۆر (دکتۆر بی) بڕیاری دا بەیانی دەستێك یاری لە دژی چێنتۆڤیچ بکات. بەڵام زۆر بە ڕاشکاوی تکای ئەوەی کرد، کە هاوڕێکانیشم لەوە ئاگادار بکەمەوە، کە زۆر هیوایان بە توانای ئەو نەبەستنەوەو، بە زەردەخەنەیەکی سووکەوە ووتی "چونکە بە ڕاستی نازانم، کە ئایا من بەهرەی ئەوەم هەیە، گەمەیەکی شەترەنج بە پێی هەموو یاساکانی شەترەنج بێ هەڵە یاری بکەم یان نا، تکایە باوەڕم پێ بکە ەهیچ شێوەیەك نەمویستووە



بە ئانقەست خۆم بە سادە پیشان بدەم، کاتێ ووتم، من لەسەردەمی خوێندنی ئامادەییەوە، واتە پتر لە بیست ساڵە یاریم نەکردووە، دەستم لە هیچ بەردێکی شەترەنج نەداوە، لەوان سەردەمیش، من هەر یاریکەرێکی سادە بوویمە و هونەرێکی تایبەتیم نەبووە!"

بە شێوەیەکی ئەوەندە سروشتی ئەو قسانەی کرد، کە من کەمترین گومانم لە راستی قسەکانی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی سەرسوڕمانی خۆم لەوە پێشان نەدەم، کە چۆن توانی وا بە وردی هەڵکەوتەی یاری پاڵەوانە جیاجیاکان بێنێتەوە بیری خۆی" بەڵام دەبێت بە لای کەم لە رووی تیۆرییەوە خۆی زۆر بە شەترەنج خەریك کردبێت. (دکتۆر بی) زەردەخەنەیەکی زۆر سەرنجراکێشی هاتێ و وەك ئەوەی خەون ببینێت ووتی :"زۆرم خۆ پێوە خەریك کردووە! خوا دەزانێت، بەڵێ دەتوانرێ وا بگوترێت، کە من خۆم بە شەترەنج خەریك کردووە، بەڵام ئەوەیان لە بارێکی زۆر تایبەتی بووە، لە بارێکی زۆر دەگمەن و بێ وێنە، ئەوەیان چیرۆکێکی هەندێك ئالۆزە، بەڵام هەر چۆنی بێت دەتوانرێت وەك یارمەتییێکی بچووك تەماشا بکرێت، بۆ سەردەمە گەورە خۆشەویستەکەمان. ئەگەر ئێوە نیو کاتژمێرێك سەبر بکەن..."

ئەمەی ووت و ئاماژەی بۆ کردم کە لە تەنیشتییەوە لەسەر قەرەوێلەکە دابنیشم، منیش بە خۆشییەوە داواکەییم جێبەجێ کرد. کەسمان لا نەبوو. (دکتۆر بی) چاویلکەکانی لە چاو کردەوەو لە لاییێکی دانان و دەستی بە گ[illegible]ەوە کرد:



" دیارە تۆ مرۆڤێکی دۆسپەروەری، کە دەفەرموون، وەك هاوشارییێکی ڤییەننایی ناوی خانەوادەکەمانت دێتەوە یاد. بەڵام من مەزەندەم بۆ ئەوە دەچێت، کە ناوی ئەو نوسینگەی پارێزەرییەت نەبیستبێ، ئەوەی کە من لەگەڵ باوکم، پاشتریش بە تەنها بەڕێوەمان دەبرد. سەبارەت بەوەی ئێمە ئەو کێشانەمان

وەرنەدەگرت، ئەوانەی لە رۆژنامەکان شتیان لەبارە دەنووسرا، ئێمە لەبەر خاتری ئامانجەکانی خۆمان هیچ کێشەیەکی نوێمان وەرنەدەگرت. لە راستیشدا نووسینگەکەمان هەر بەناو نووسینگەی پارێزەری بوو، دەنا هەموو کارەکانی ئێمە بریتی بوون لە ئامۆژگارکاری یاسایی تەنها بۆ بەڕێوەبردنی دارایی دێر و کلێسا گەورەکان، لەبەرئەوەی باوکم وەك ئەندامێکی پێشووی پەرلەمان لە لاییێك پەیوەندی نزیکی بە پارتە کلێسایییەکانەوە هەبوو، لەلاییێکیش (جا چونکە مەلەکییەت تەنها هەر لە مێژوو ماوە دەتوانین قسەی لە بارەوە بکەین)، باوکم باوەڕی ئەوەی پێ درابوو کە سەرپەرشتی دارایی هەندێك لە ئەندامانی خێزانی قەیسەری دەکرد. ئەو پەیوەندییەمان لەگەڵ کلێساو قەیسەر، دیارە مامیشم پزیشکی تایبەتی قەیسەری پێشوو بوو، دەگەڕێتەوە بۆ دوو پشتی پێشوومان. دەبێ ئەوەش بڵێم، کە ئەوە کارێکی ئاسوودەو بێ سەرێشە بوو، ئەو باوەڕییە بە میرات بەر ئێمە کەوتبوو. ئەو کارە جگە لە ڕازگری لە ناو بازنەیەکی تەنگ و دەستپاکی، ماندووبوونێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو، باوکیشم خاوەنی ئەوپەڕی بەهرەی دەستپاکی و پاراستنی نهێنی بوو. جگە لەوەش توانیبووی چ لە [illegible]مەکانی قەیرانی ئابووری و چ



لە کاتی دابەزینی نرخەکان، بە هۆی لێکدانەوەی ورد و پێشبینییەکانی خۆی، سامانێکی باش بۆ مەعمیلەکانی خۆی بەدەست بهێنێت. ئەو کاتەی کە هیتلەر حوکمی ئەلمانیای کەوتە دەست، دەستی کرد بە ڕاو و ڕووتی سامانی دێر و کلێساکان، لەوبەری سنوورەوە هەندێ سەوداو گواستنەوەی سامان دەستی

پــیٚ کــرد، بــۆ ئــەوەی بــەلای کەمــەوە ســامانە گواســتراوەکان لــە دەستبەسەرداگرتن رزگار بکرێن، ئەوەش بە سەرپەرشتی ئێمەو هەندیٚ سەودای سیاسی نهێنی لە نێوان کاربەدەستانی کلێساو حکومەتی قەیسەر جێبەجیٚ دەکران. من و باوکم پتر لە لایەنە رەسمییەکان ئاگاداری ئەو سەودایە بووین. نووسینگەکەی ئێمە سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا، چونکە هیچ تابلۆیەکیشمان لەبەر دەرگــا هەڵنەواســی بــوو، هــەروەها ئاگــاداری خۆمــان بــووین، هــەردووکمان خۆمــان لــەوە دەپاراســت، ڕوو بــە ڕوو راســتەوخۆ ئەندامانی خێزانی قەیسەر لە نزیکەوە ببینین، ئەمە هەمووی وای کردبوو، کەس بەری بە ئێمەوە نەبێت. لەو هەموو ساڵانە هیچ فەرمانبەرێکی نەمساوی جارێك مەزەندەی بۆ ئەوە نەدەچوو، کە پۆستە نهێنییەکانی قەیسەر، گرنگترینی پۆستەکانی، دەگەیشتنە نووســینگە شــاراوەکەی ئێمــە لــە نهــۆمی چــوارەم، لــەوێش وەردەگیران و دەنێردران.

ئیتر ئەوە بوو، ناسیۆنال سۆسیالیستەکان لە مێژ بوو دژی جیهان خۆیان پڕ چەك کردبوو، مەترسییێکی گەورەی تر ئەوە بوو، وڵاتە دراوسێکانیش خەرد شق و رێکخستنی یەکە جۆر



بەجۆرەکانی سوپا بوون، لە هەموو کارگەیەك شانەیەکیان دامەزراندبوو، لە ژووری تایبەتی (دۆلفۆس)ەوە بگرە تا ژووری (شوشنیگ)[*] بنکەکانی سیخوری و گوێگرتن دامەزرا بوو، تەنانەت لە نووسینگەکەی ئێمەش پیاوێکی خۆیان دانابوو، کە بە

[*] دۆلفۆس کانسلەری ئەوسای نەمساو شوشنیگیش وەزیری لێکۆڵینەوە(دراسات) بووە لە کابینەکەی. (وەرگێڕ)

داخەوە من درەنگ بەوەم زانی. من ئەو پیاوەم بە تکای قەشەیەك لە نووسینگەکەم دامەزراند، پیاوێکی هەژاری بیٚ بەهرە لە کاری نووسینگە، تەنها ئەرکی ئەوەم پیٚ سپاردبوو، کە چاوەدێری رووی دەرەوەی نووسینگەکە بێت، لە ڕاستیدا ئێمە هیچ کارێکمان پیٚ نەدەکرد، جگە لە رێکخستنی فایل و تەلەفۆنکاری، ئەو فایلانەی کە بیٚ بایەخ بوون و گرنگ نەبوون. ئەو بۆی نەبوو نامەکانی پۆست بکاتەوە، نامە گرنگەکان بە دەستی خۆم بە چاپی دەست دەمنووسین و هیچیانیشم کۆپی نەدەکرد. هەر دۆکۆمێنتێکی گرنگیش بوو، لەگەڵ خۆم دەمبردەوە بۆ ماڵ. هەموو قسەکردنێکی گرنگیشم دەخستە کلێسا، یان بۆ نووسینگەی مامم. بەهۆی ئەو هەموو ئاگادارییەم، دەزگا سیخور و گوێگرەکان نەیاندەتوانی پەی بە کارەکانمان بەرن" بەڵام دەبێت بە ڕێکەوت ئەو پیاوە چاوچنۆك و خۆپەرستە ئەوە سەرنجی ڕاکێشابێت، کە ئێمە باوەڕی پیٚ ناکەین و لە پشت سەری ئەو شتە گرنگەکانی نووسینگە جێبەجیٚ دەکرێن. یان لەوانەیە جارێك لەو جارانەی کە من لەویٚ نەبوویمە، پەیکەکانی قەیسەر لە جیاتی ناوی نهێنی (بارۆن فێرن) گو ن (جەنابی قەیسەر)، یان ئەو



هۆقەبازە جارێك بە دزی و بی بیربی ئێمە نامەیەکی کردبێتەوە. هەرچۆنی بێت، بیٚ ئەوەی من هەستی پیٚ بکەم، لە مونیخ یان لە بەرلینەوە، ئەوپیاوەیان راسپاردبوو، کە چاوەدێریمان بکات. درەنگ زۆر درەنگ ئەو کاتەی من خرابوومە بەندیخانە، ئەوەم هاتەوە یاد، کە ئاکاری بەرامبەر کارە سەرەتاییەکانی لای ئێمەی، لە مانگەکانی دوایی لە ناکاوێك گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، خۆی لە

کارەکانی ترمان هەڵدەقورتاند و چەند جارێکیش بە جەختەوە تەکلیفی ئەوەی دەکرد کە نامەکانی من بەرێت بۆ پۆست. واتە ناتوانم بڵێم هیچ کەڵێنێك لە کارەکانم نەبووە، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە گەورەترین پیاوانی دیبلۆماسی و سوپاش لە نەخشە فێڵاویەکانی هیتلەر رزگاریان نەبوو. بە تەواوی لە کەیەوە گێستاپۆ سەرنجی کەوتبووە سەر من، ئەوە دەتوانین لەوە بیخوێنینەوە، کە لە هەمان ئەو ئێوارەیەی (شوشیگ) دەستی لە کار کێشایەوەو رۆژێکیش بەر لە هاتنی سوپای هیتلەر بۆ ناو ڤیەننا، من لەلایەن پیاوانی SS[8] دەستگیرکرام. بەس باش بوو هەر کە وتاری دەست لەکارکێشانەوەی شوشیگم لە رادیۆ بیست، بەختی ئەوەم هەبوو بەر لە هاتنی ئەو پیاوانە، بەوە ڕابگەم گرنگترینی بەڵگەنامەکان بسووتێنم و، خولەکێك بەر لە گەیشتنی ئەوان دۆکۆمێنتە زۆر گرنگەکانی تر، ئەوانەی بەڵگەی پێویست بوون بۆ ئەو پارەو سامانەی دێر و دوو مەترانی بەرز، کە لە دەرەوە گواسترابوونەوە. هەمووم لە ناو سەبەتەیەکی جلوبەرگی شۆرین شاردنەوەو بە هۆی ئەو ژنەی دەمێك بوو خزمەتی ماڵەوەی دەکردین و ببوو بە جێگەی باوەڕمان، ناردمن بۆ ئەو بەر بۆلای مامم.

(دکتۆر بی) قسەکانی خۆی بڕی، تا جگەرەیەك دابگیرسێنێت. لەبەر رۆناکییە کزەکە، توانیم سەرنجی ئەوە بدەم، لێوەلەرەیەك، کە نیشانەی دڵەڕاوکێ بوو، نیشتبووە سەر گۆشەی دەمی راستی، پێشتریش ئەم لێوە لەرەیە سەرنجی ڕاکێشابووم، هەر چەند خولەکێك جارێك ئەو لێوەلەرەیە دووبارە دەبووەوە. لێوەلەرەیەك بوو دەهات و دەچوو، لێوەلەرەیەکی زۆر سووك بوو، بەڵام شێوەیەکی سەرنجڕاکێشی دەبەخشییە دەموچاوی.

"لە وانەیە" ئێستا جەنابتان چاوەڕوانی ئەوە بکەن، کە من باسی باری ناو ئۆردگا زۆرە ملێکانت بۆ بکەم، ئەو ئۆردگایانەی دەبوون بە شوێنی هەموو ئەو کەسانەی کە بەرامبەر نەمسای کۆن وەفادار دەمانەوە، چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت کە باسی ئەشکەنجەو ئازارەکانی ئەوێمت بۆ بکەم. بەڵام ئەوە بەسەر مندا نەهات. من سەر بە تاخمێکی تر بووم. من سەر بەو تاخمانە نەبووم کە تووشی ئازاردان و هەتکی جەستەیی و گیانی دەکران. بەڵکوو من سەر بەو کۆمەڵە بچووکە بووم، کە ناسیۆنال سۆسیالیستەکان هیوای ئەوەیان پێ بوون، پارەو زانیاری گرنگیان لێ دەربهێنن. لە ڕاستیدا کەسایەتی خودی من بۆ گێستاپۆ بایەخێکی نەبوو" بەڵام دەبێت بەوەیان زانیبێت کە ئێمە نوێنەری یاسایی و بەڕێوەبەر و جێ متمانەی دوژمنە سەرسەختەکەی ئەوان بووین، وە ئەوەی دەیانەویست لە منی دەربهێنن، بەڵگەی ماددی بوو: بەڵگە دژی ئەو دێر و کلێسایانەی کە مەبەستیان بوو، لەسەریان بسەلمێنن، کە سامانەکانی خۆیان حەشارداوە، بەلگە دژی خێزانی قەیسەر و دژی هەموو ئەوانەی کە خۆنەویستانە خزمەتی مەلەکییەتیان دەکرد. مەزەندەی ئەوەیان دەکرد و مەزەندەکەشیان ڕاست بوو، کە بەو داراییەی بە دەستی ئێمەوە ڕەت ببوون، سامانێکی باشیان پێ دەگات، ئەو سامانەی کە شاراوەبوو و هێشتان

---

پۆلیسی نهێنی ئەلمانیای نازی– و

SS (Schutzstafel) = دائیرەی ئەمن– و

دەستی تەماعیان نەیگەیشتبویٚ. بۆیە هەر لە ڕۆژی یەکەمدا، منیان هێناو دەیانویست بە باشترین ڕێگای خۆیان بە زۆر ئەو نهێنیانەم لیٚ وەربگرن. ئەو کەسانەی کە وەکوو من، گەرەکیان بوو زانیاری گرنگ یان پارەیان لیٚ دەربهێنن، ڕەوانەی ئۆردگازۆرە ملێکان نەدەکران، بەڵکوو بۆ سەوداو ڕەفتارێکی تایبەتی جیادەکرانەوە. لەوانەیە جەنابتان لە بیرتان مابێت، کانسلەرەکەمان لە لاییك و لە لاییکی تر (بارۆن رۆت شیلد) و خزمەکانیان، کە هیوای ئەوەیان پیٚ هەبوون، ملیۆنانیان لیٚ دەربهێنن، هیچیان نەخرانە ئۆردگا زۆرە ملێکانی پشتی تێڵدڕکەکان، بەڵکوو بە ڕووکەش گوایە وەکو کەسانی تر تەماشا ناکرێن و ڕێزیان لیٚ دەگیرێت، هەموو گواسترانەوە بۆ هوتێلی (میترۆپۆل)، ئەو هوتێلەی کە لە هەمان کاتتدا بارەگای گێستاپۆ بوو، لەو هوتێلە هەر کەسەو ژوورێکی تایبەتی پیٚ دەدرا. ئەو ئیمتیازەیان بە پیاوێکی نادیاری وەکوو منیش بەخشی.

ژوورێکی تایبەت لە هوتێل! زۆر مرۆڤانە دێتە بەر چاو، وا نیە؟! بەڵام باوەڕ بکەن، بە هیچ شێوەیەك ئەمەیان لە بیرێکی مرۆڤدۆستییەوە بۆ نەهاتبوو، بەڵکوو لە روانگەییێکی فێلبازییەوە سەری هەڵدابوو. ئاوا ئێمەیان وەکو کەسایەتییەکی تایبەت فڕیٚ نەدابووە ناو ئۆردگاییێکی سارد و بەستەلەك، بەڵکوو خرابووینە ژوورێکی تایبەت و گەرمی هوتێلێك. چونکە دەیانزانی ئەو (ماددە)یەی کە دەیانەویست لە ئێمەی دەربهێنن، تەنها بە شێوازێکی نەرم و نیان دەکەوتە دەستییان، نەك بە لێدان و قامچی و ئەشکەنجەی جەستەیی: ئەویش بە ڕێگای دانانمان لە ناو (دابڕان)ێکی ورد بیر لیٚ کراوە. هیچیان لیٚ نەدەکردین، تەنها ئەوە نەبێت ئێمەیان خستبووە ناو (هیچ)ێکی تەواو. دیارە زانیویانە کە هیچ شتێکی سەر ئەو زەوییە بە قەد (هیچ) پالەپەستۆ ناخاتە سەر گیانی مرۆڤ. ئەوان هەر یەکێك لە ئێمەیان بە تەنها لەناو بۆشاییێکی تەواو زیندانی کردبوو. لەناو ژوورێکی کونبڕ و دابڕاو لە جیهانی دەرەوە. مەبەستیان بوو لەجیاتی ئەشەکەنجەو ئازاردانی دەرەکی، پالەپەستۆ و زۆری بخەنە سەر دەروونمان، تا ئەو ڕادەیەی بە ناچاری زمان دەکەوێتە قسە. ئەگەر یەکەم جار تەماشای ژووەرەکەمت کردبایە، هیچ شتێکی وات نەدەدی، کە بۆنی نائاسوودەیی لیٚ بێت. دەرگاییێك، تەختێکی خەو، قەنەفەییێکی یەك نەفەری، مێزێك، دەستشۆرێك، پەنجەرەیەکی تەڵبەند. بەڵام شەو و ڕۆژ دەرگاکە داخرا بوو. نەدەبووایە کتێبێك، ڕۆژنامەیەك، پارچە کاغەزێك، یان قەلەمێك لەسەر مێزەکەدا هەبێت. پەنجەرەکەش بەرامبەر دیوارێکی ئاگربڕ بوو. لە دەوری (من)ەکەی خۆم وتەنانەت لەدەوری جەستەکەشم، شورای هیچێکی پتەو دەوری دابوو. هەموو شتێکیان لیٚ سەندبووم، کاتژمێرەکەم، تا هیچ لە بارەی کات نەزانم، پێنووسەکەم، تا نەتوانم شتێك بنووسم، قەڵەمبڕەکەم تا من نەتوانم ئەوەی تر والاّ بکەمەوە، تەنانەت سادەترین سڕکەرێکی وەك جگەرەشیان لیٚ قەدەغەکردبووم. جگەلە پاسەوانەکەم، کە هیچ قسەیەکی نەدەکرد و، بۆی نەبوو وەڵامی هیچ پرسیارێکم بداتەوە، هیچ دەموچاوێکی ترم نەدەدیت، هەرگیز گوێم لە دەنگی مرۆڤ نەدەبوو" چاو وگویٚ و هەستەکانی ترم لە بەیانییەوە تا شەو، لە شەوەوە تا بەیانی،

کەمترین خۆراکیان وەرنەدەگرت. تەنها لەگەڵ خۆم وجەستەو چوار پێنج شتی کەڕ و لاڵ جێیان هێشتبووم، لەگەڵ مێزێک، قەرەوێلەیەک،پەنجەرەیەک و دەستشۆرێک، بێ فریارەس بە تەنها. وەکو ئەوە وا بوو، خرابیتە ناو شووشەیەکی داخراو فڕێ درابیتە ناو دەریای ڕەشی ئەو کپییە، وەکوو کەسێک نقوومی ژێر دەریا بوو بێت و پەتی پەیوەندی بە دنیای دەرەوە پچڕا بێت و هەرگیز نەتوانێت سەرئاو کەوێتەوەو لەو قوڵاییە پڕ کپی و بێ دەنگییە ڕزگاری بێت، هیچ نەبیستێ، هیچ نەبینێ، هەمووی دەورت، لە هەموو لایێک تا چاو بڕ دەکات هەر (هیچ) بێت، بۆشاییێکی بێ ژوور و بێ کات. سەردەکەوی و ژێر دەکەوی، بە خەیاڵی سەرکەوتن و ژێرکەوتن، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، دووبارە سەرکەوتن و ژێرکەوتن و دەمێنیتەوە. بەڵام ئەندێشەش بەو نابەرجەستەییەی خۆی پێویستی بەپنتێکی ڕاگیربوون هەیە، دەنا بە دەوری خۆی تووشی سووڕانەوەیەکی بێ مانا و بێ هودە دەبێت، تا وای لێ دێت ئیتر بەرگەی (هیچ)یش ناگرێت. ئەگەر مرۆڤ چاوەڕوانی شتێکی کرد، لە بەیانییەوە تا ئێوارە، بەڵام هیچ شتێک ڕووی نەدا، دیسان چاوەڕوانی کرد و دیسان هیچ شتێک ڕووی نەدا، مرۆڤ چاوەڕوانی کرد و چاوەڕوانی کرد، بیری کردەوە و بیری کردەوەو بیری کردەوە، تا لاکەی سەری کەوتە ژان، چی ڕووی نەدا، تەنها مایەوەو تەنها تەنها.

بەو جۆرە چواردە ڕۆژم لە دەرەوەی کات بردە سەر، لە دەرەوەی جیهان ژیام، خۆ ئەگەر لەو کاتە جەنگیش هەڵبگیرسابایە، من پێم نەدەزانی، من ئاگاداری هیچ نەبووم" چونکە لەو کاتانەدا جیهانەکەی من پێکهاتبوو لە مێزێک، دەرگایێک، قەرەوێلەیەک، قەنەفەیەک، پەنجەرەیەک و دیوارێک. هەمیشە چاوم بەرامبەر هەمان کاغەزی سەر هەمان دیوار لە ئەبلەقدا مابوو" ئەوەندەم تەماشای هێڵە نەخشەکانی ئەو کاغەزە کردبوو، وای لێ هاتبوو، نەخشەو پێچەکانی سەری هەتا ناوەوەی لۆچەکانی مێشکم وەکو نەخشەییێکی هەڵکۆڵراو، ڕۆچوو بوو. ئەوجا لێکۆڵینەوە دەستی پێ کرد. لە ناکاوێک بانگیان دەکردی، بێ ئەوەی تۆ بزانیت ڕۆژە یان شەو. بانگیان دەکردیت و بە ناو چەند ڕاڕەوێکیان ڕەت دەکردی، پیاو نەیدەزانی بۆ کوێی دەبەن" پاشان لە شوێنێک ڕایان دەگرتی و دەبووایە چاوەڕوان بکەیت، نەتدەزانی لە کوێ وەستاوی، لە ناکاوێک خۆت لەبەر دەمی مێزێک دەدۆزییەوە، لەدەوری مێزەکە چەند کەسێک بە جلوبەرگی سەربازی دانیشتوون. کۆمەڵێک کاغەز لەسەر مێزەکە دانرابوون، نەتدەزانی ئەو کاغەز و فایلانە چیان تێدا نووسراوە، ئەوجا پرسیار دەستی پێ دەکرد، پرسیاری ڕاست و پرسیاری ساختە، پرسیاری ئاشکراو، پرسیاری فێڵبازانە. پرسیاری داپۆشراو و پرسیاری تەپکەدار، کاتێک وەڵامی پرسیارەکانت دەدایەوە، ئەو پیاوە ناماقوڵانە، بە پەنجە کینەدارەکانیان کاغەز و فایلەکانیان هەڵدەدایەوە، ئەو کاغەز و فایلانەی نەدەزانرا چییان تێدایە. ئەو پەنجە کینەدارانە شتێکیان لە پرۆتۆکۆلی لێکۆڵینەوە دەنووسی، پیاو نەیدەزانی چی دەنووسن. ترسناکترین شت لەو پرسیار و لێکۆڵینەوانەدا ئەوە بوو، هەرگیز نەمدەتوانی ئەوە هەڵبهێنم، یان شێ بکەمەوە، کە پیاوەکانی گێستاپۆ بە ڕاستی چییان لە بارەی

نووسینگەکەی من زانیوەو، ئێستا دەیانەوێت چیم لێ دەربهێنن. هەروەکو بە جەنابتم ڕاگەیاند، دوا بەڵگەی گرنگ و سەلمێنەرم لەدوا سەعاتی بەرلە گرتنم، بە هۆی خزمەتکارەکەمان ناردەلای مامم، بەڵام ئایا ئەو بەڵگەنامانە گەیشتنە لای مامم؟ ئەگەر نەگەیشتوون، ئەوانە دەستیان بەسەر چەند نامەدا گرتووە؟ چەندەیان زانیاری لە بارەی نووسینگەکەم لا ئاشکرا بووە،؟ لەو ماوەیەدا چەندەیان لە پیاوەکانی دێرو کلێساکان دەرهێناوە، ئەوانەی ئێمە نوێنەرایەتیمان دەکردن؟ ئەوانیش پەیتا پەیتا پرسیاریان لێ دەکردم. کام کاغەزی بەهادارم (وەك چەك و بەشەفۆند–و) بۆ دێروکلێساکان کڕیوە؟ بەڕێگەی کام بانك، کارەکانم جێبەجێ کردووە؟ ئایا من پیاوێك دەناسم بە ناوی (ساوندسۆ)؟ ئایا من نامەم لە سویسراوە بۆ هاتووە؟ هەروەها لە(شتێنۆکرێزێل)ەوە؟ جا چونکە من نەمدەزانی ئەوان چەندە زانیارییان دەستکەوتووە، ئەوا هەر وەڵامێکی من لێپرسراوییەتێکی گەورەی بە دواوە بوو، ئەگەر دانم بەشتێکی وا بنابایە، کە ئەوان هیچ زانیارییێکیان لە بارە نەبووایە، ئەوا لەوانەبوو بەبێ ئەوەی ناچاربم، کەسێك بنێرمە بەردەمی سیکارد. خۆ زۆریشم پاکانە کردبا، ئەوا زیانم بەخۆم دەگەیاند.

بەڵام ناخۆشترین شت لێکۆڵینەوە نەبوو“ ناخۆشترین شت ئەو کاتە بوو، کە لە دوای لێکۆڵینەوە دەگەڕامەوە ناو (هیچ)ەکەم. بۆهەمان ژوور، هەمان مێز، هەمان قەرەوێڵە، هەمان دەستشۆر، هەمان کاغەزی دیوار. کە دەگەیشتمەوە ژوورەکەم و بە تەنها دەمامەوە، هەوڵم دەدا لێکۆڵینەوەکە بهێنمەوە بیری خۆم، بیرم لەوە دەکردەوە چ وەڵامێك ژیرانەتر بوو بمدابایەوە؟ جاری ئایندە گەرەکە چی بلێم؟ بۆ ئەوەی گومان لەسەر خۆم لاببەم، ئەو گومانەی کە لەوانەیە لە ئەنجامی وەڵامێکم، بێ ئەوەی بیرم لێ کردبێتەوە، کەوتبێتە سەرم. بیرم دەکردەوە، بیرم دەکردەوە، دەمهێناو دەمبرد، هەموو دەربڕینەکانی خۆم وشە بەوشە هەڵدەسەنگاند، ئەوانەی بە دادوەری لێکۆڵەرم ووتبوو، هەموو پرسیارەکانم دەهێنایەوە بیری خۆم، ئەوانەی لێم کرابوون، هەموو وەڵامێك، کە دابوومنەوە، هەوڵم دەدا ئەوانەیان بدۆزمەوە کەخراونەتە ناو پرۆتۆکۆلی لێکۆڵینەوە، دیارە ئەوەشم هەرگیز بۆ ئاشکرا نەدەکرا. بەڵام ئەو بیرکردنەوانە دەگەیشتنە بۆشایی ژوورێك وئیتر وازیان نەدەهێنا، لە مێشکم دەخولانەوە، هەمیشە لە نوێوەو لە پێکەوە بەستنێکی تر، ئەوە دووبارە دەبووەوە، تا خەوم لێ دەکەوت. لەدوای هەموو لێکۆڵینەوەیەکی پیاوانی گێستاپۆ لەگەڵم، ئەو ئەندێشەو بیرکردنەوانەی خۆم دەبوون بە دێوەزمێك و ئەشکەنجەیان دەدام، ئەشکەنجەو ئازاری پرسیار ولێکۆڵینەوە، تەنانەت ئەوانە لەو لێکۆڵینەوانەش ئازاردەتر بوو، کە کاتژمێرێکی دەخایاند، چونکە ئەوانەیان لە سایەی ئەشکەنجەو ئازاری ئەو تەنهاییە هەرگیز کۆتاییان نەدەهات و، هەمیشە لە دەوری خۆم مێز و کانتۆر و قەرەوێڵەو کاغەزی دیوارو پەنجەرەکەم دەدیت. شتێکی تر نەبوو سەرنجم بۆخۆی رابکێشێت، کتێبێك، رۆژنامەیەك، دەموچاوێکی غەریب، پێنوسێك بۆ نووسینی تێبینییەك، دەنکە شقارتەیەك، تا یاری پێ بکەم، هیچی تر، هیچی تر، هیچی تر. ئێستا تێگەیشتم کە ئەو

سیستەمی ژووری هوتێلە چەندە زۆردار و بكوژانە بیری لێ كراوەتەوە، لەوانە بوو لە ئۆردگای زۆرە ملێ بە عارەبانەیەك بەردم پێ بگوازنەوە، تا ئەو ڕادەیەی خۆێن لە دەست وقاچەكانم دەبیبەست، یان لەگەڵ چەند كەسێكی تر دەیانخستینە شوێنێكی بۆگەن و سارد. بەڵام خۆ لەوێ مرۆڤ دەموچاوی مرۆڤی دەدیت، ئاقارێك، عارەبانەیەك، درەختێك، ئەستێرەیەك، شتێكی هەر دەدیت تەماشای بكات، كەچی ئەلێرە هەمیشە یەك دیمەن هەیە، هەمیشەو هەمیشە هەمان دیمەن، هەمان دیمەن، ناخۆشترین شت ئەو هەمان دیمەنیە. لەو ژوورە شتێك نەبوو سەرنجم بۆخۆی ڕابكێشێت و لە ئەندێشەكانم رزگارم بكات، لە خەیاڵە شێتانەكەم، لە نەخۆشی دووبارە بیركردنەوە لە ڕووداوەكان. ئەوان كتومت ئەوەیان مەبەست بوو، دەبووایە من لە ناو بیركردنەوەدا بخولێمەوە، تا دەمخنكێنن، تا وای لێ دێت، چیتر نەتوانم، جگە لەوەی دەرخواردیان بدەم، جگە لەوەی قسەیان بۆ بكەم، جگە لەوەی هەموو شتێكییان پێ بڵێم، ئەو شتانەی ئەوان گەرەكیان بوو، زانیاری لە بارەی مرۆڤەكان. وردە وردە هەستم بەوە دەكرد، كە دەمارەكانم خەریكە لەژێر پالەپەستۆی ئازاراوی ئەو (هیچ)ە دەست بە خاوبوونەوە دەكەن، لە كاتێكدا كە ترسی ئەوەم هەبوو لە گرژییەوە بپچڕێن. هەموو هەوڵێكم دەدا شتێك، هەر شتێك بدۆزمەوە تا خۆمی پێ لەبیرببەمەوە، خۆمی پێ خەریك بكەم، ئەو شتانەی رۆژێك لە رۆژان ئەزبەرم كردبوو، سرووودی نەتەوایەتی، یارییەكانی سەردەمی منداڵی، نوكتەكانی سەردەمی ئامادەیی، بەندەكانی كتێبی یاسای هاووڵاتیی. پاشان دەستم دەكرد بە



لێكدانەوەی ماتماتیكی، بێ پایان ژمارەم لەگەڵ یەكتر كۆدەكردەوەو لێكم دەردەكردن، دابەشی یەكترم دەكردن، بەڵام لەم بۆشایی ئەندێشەدا هیچ هێزێك نەبوو ڕایانبگرێت. نەمدەتوانی لە هیچ شتێك ورد ببمەوە، هەمیشە هەمان و هەمان خەیاڵ دەهاتە نێوانەوە: چی دەزانن ئەوانە؟ دوێنێ چیم وت؟ پێویستە جاری ئاینده چی بڵێم؟ ئەو بارە كە ناتوانرێت بە وشە پێناسەی بكرێت، چوارمانگی خایاند. (چوار مانگ) ئەوە دەتوانرێت بە ئاسانی بنووسرێت: چوار مانگ، دوو بڕگەی ساكارە. بە چارەگە چركەیەك، خێرا لێوەكان دەنگەكان دیاری دەكەن: چوار مانگ! بەڵام هیچ كەسێك ناتوانێت ئەوە بێنێتە بەرچاوی خۆی، بیپێوێت، ڕۆشنی بكاتەوە، كە ئەو كاتە چەندە درێژ خایەنە لە شوێنێكی خاڵی لە ژوور (فەزا)، نە یەكێكی تر و نە خۆت، لە شوێنێكی خاڵی لە تەوەرەی كات، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ئەوە ڕۆشن بكاتەوە، كە ئەو بارە چەندە دڕندەو وێرانكەرە، ئەو هیچ و هیچ وهیچە لە دەوری كەسێك، كەهەمیشە تەنها مێزێك، قەرەوێلەیەك، دەستشۆرێك، كاغەزێكی دیوار، بێ دەنگی و كپییەكی هەمیشەیی دەوری دابێت، خواردنت بۆ پاڵ پێوە بنێنن بۆ ژوورەوە، هەمیشە هەمان ئەندێشە، هەر لە دەوری هیچ بخولێیتەوە تا شێت دەبیت. دەركەوتنی نیشانەیەك نائارامی كردبووم، هەستم دەكرد نیزامی مێشكم بەرەو تێكچوون دەچوو، لە سەرەتای هێنانم بۆ ئێرە، ئەوكاتەی لێكۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەكردم، هێشتان لەدەروونەوە ڕۆشن بووم، ئارام بووم و بیرم دەكردەوەو قسەكانی خۆم دەردەبڕی" بیركردنەوە دووبارەییەكەم

کاری دەکرد، پێویستە چی بڵێم و چیش نەڵێم، بەڵام ئێستا رستە سادەکانیشم بە لارو پتی بۆ دەگوترێتەوە، چونکە لەو کاتەی من قسەم دەکرد، بە چەشنێك تەماشای ئەو قەلەمەم دەکرد، کە پرۆتۆکۆلەکەی دەنووسییەوە، دەتگوت چاوەکانم هوپینۆزە کراون. هەستم بەوە دەکرد کە بەرەو بیٚ هێزی دەڕۆم، هەستم بەوە دەکرد، وردە وردە ئەو کاتە نزیك دەبێتەوە، کە خۆمی تێدا رزگار بکەم و هەموو شتێك هەڵبڕێژم، ئەوەی دەمزانی و نەمدەزانی، بۆ ئەوەی لە دەستی ئەو هیچە رزگارم ببێت، کە خەریك بوو تەنگی پیٚ هەڵدەچنیم و دەیخنکاندم. بیٚ پشوو بە یەك نەفەس دوازدە مرۆڤ و نهێنییەکانیان ئاشکرا بکەم، ، بیٚ ئەوەی خۆم زۆر خەریك بکەم. هەر بەڕاستی ئێوارەیەك خەریك بوو بگەمە ئەو قۆناغە: ئەو کاتەی کە بە ڕێکەوت لەو کاتی خنکانەدا پاسەوانەکە خواردنی بۆ هێنام“ لە پڕێکدا قیژاندم :"بمبە بۆ لێکۆڵینەوە! دەمەویٚ هەموو شتێك ئاشکرا بکەم، دەمەویٚ هەموو شتێك دەربڕم! دەمەوێت بڵێم کاغەزەکان لە کوێن، پارەکان لە کوێن! هەموو شتێك دەڵێم" بەڵام لە بەختەوەریم ئەو گوێی لە من نەبوو، لەوانەشە هەر نەیویستبێت گوێی لە قسەکانم ببێت.

لەو بارە ناخۆش و تەنگەتاوەدا شتێکی سەیری چاوەڕوان نەکرا هاتە پێشەوە، ئەو شتەش ڕزگاری پێشکەش دەکردم، بەلای کەم بۆکاتێکی دیاریکراو، کۆتایی مانگی تەمووز بوو، رۆژێکی تاریکی باراناوی بوو: ئەو رۆژەم بە وردی لە بیرە، چونکە لەو کاتەی منیان بۆ لێکۆلینەوە بە ڕاڕەوەکاندا دەبرد، باران بە جامی ڕاڕەوکان دەکەوت و ترپەی دەگەیشتە گوێم. دەبووایە لەبەر دەرگای ژووری دادوەری لێکۆلینەوە چاوەڕیٚ بکەم. بەر لە هەموو لێکۆلینەوەیەك ئەو چاوەڕوانییە هەبوو. ئەوچاوەڕوانی کردنەش بەشێك بوو لە تەکنیکی لێکۆلینەوەکەیان. کاتێك لە نیوەشەودا بانگیان دەکردی و لە ژوورەکەت هەڵییان دەگرتی و دەیانبردی بۆ لێکۆلینەوە، هێزی مێشك و ئیرادەی مرۆڤ شەتەك دەبوو، چاوەڕووانیان بە مرۆڤ دەکرد، چاوەڕوانییێکی بیٚمانا، پڕ مانا، سەعاتێك، دووسەعات، سیٚ سەعات، تا ئەو کاتەی جەستەی مرۆڤ دادەهێزرا وخەستە دەبوو، تا گیان لە خۆی وەڕس دەبوو، ئەو رۆژە کە چوارشەممە بوو، بە تایبەت زۆریان ڕاگرتم، بیست و حەوتی تەمووز بوو، دوو سەعاتی تەواو بە پێوە چاوەڕوانییان پیٚ کردم“ هۆییێکی تایبەت هەبوو، بۆ ئەوەی بزانم ئەو رۆژە رێکەوتی چ بەرواریٚك بوو، ئەویش ئەوەیە ئەو ژوورەی پێشەوە، کە من تێیدا چاوەڕیٚ بووم، دیارە بیٚ ئەوەی بۆم هەبێت دابنیشم، دوو کاتژمێری رێك قاچەکانم جەستەیان ڕاگرتبووم، ئا لەو ژوورەدا رۆژژمێرێك هەڵواسرا بوو، جا من ناتوانم ئەوەت بۆ بخەمە بەرچاوان، چەندە من بۆ شتێکی چاپکراو یا نووسراو تێنوو بووم، ئە تاکە ژمارەیە، ئەو چەند وشە کەمە (27ی تەمووز) هەموو سەرنجی منی ڕاکێشابوو، بەرامبەری ڕامابووم و بە قووڵی تەماشام دەکردو وێنەیانم لە مێشکی خۆم هەڵکۆڵی. هەر چاوەڕوانم کرد و چاوەڕوانم کرد، تەماشای دەرگام کرد، دەبیٚ کەی بکرێتەوە، دەبیٚ لێکۆلەرەوان ئەوجارە پرسیاری چیم لیٚ بکەن، دەشم زانی شتێکی تری تەواو جیاوازم لیٚ دەپرسن، لەوەی کە من خۆم بۆ ئامادەکردووە. لە هەمان کاتدا ئازاری ئەو

چاوەڕوانی کردنە بۆ من خۆشییەکی تێدا هەبوو، ئەو ژوورەی تێیدا وەستابووم ژوورێکی تر بوو، هەمان ژوورەکەی خۆم نەبوو، فراوانتر بوو، لە جیاتی پەنجەرەیەك دوو پەرنجەرەی هەبوو، قەرەوێلەو دەستشۆری تێدا نەبوو، چوارچێوەی پەنجەرەکانی دەرزییان نەبوو، ئەو دەرزانەی ملیۆنەها جار تەماشام کردبوون، دەرگاکەی بۆیەکی تری هەبوو، قەنەفەیەکی تری تێدا بوو، هەروەها کانتۆڕێکی پڕ لە فایل و عەلاگەیەکی جل هەڵواسین، دوو یان سێ پالتۆی سەربازی تەڕی پێ هەڵواسرا بوو، پاڵتۆی ئەو نۆکەرانەی کە منیان ئەشکەنجە دەدا. بەڵێ هەندێ شتی نوێم دەدیت، ئیتر ئەوە نەمردم و شتی تریشم دیت، چاوە برسییەکانم ورد ورد، پارچە پارچە، چنگییان لەو شتە نوێیانە گیر دەکرد، بۆ نموونە بۆت باس دەکەم، دڵۆپەیەکی ئاو بە یەقەی یەکێك لە پالتۆکان ئاوێزە ببوو، سەرنجی ڕادەکێشام، لێی ورد دەبوومەوە، بە مەراقێکی بێ ماناوە چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد، کەئایا ئەو دڵۆپە ئاوە لە لۆچی پالتۆکە گلۆر دەبێتەوە، یان هێشتان چەقی قورساییەکەی بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، بەڵی هەناسەی خۆم ڕادەگرت و بە وردی سایەدی ئەو دڵۆپە بارانە دەبووم، وەك ئەوەی هەموو ژیانم بەو دڵۆپە بارانە بەسترابێتەوە، تا ئەو کاتەی دڵۆپە ئاوەکە گلۆر دەبووەوە، ئەوجا دیسان قۆپچەی پالتۆکانم دەژماردەوە، هەشت لە یەکێکیان، هەشتی ئەوەی تریان، دەی سێیەمیان، ئەوجا لەگەڵ یەکتری بەراوردم دەکردن. چاوە برسییەکانم یەك یەکی ئەو شتە بێ بایەخانەی دەپشکنی، لە دەوریان دەسووڕایەوە، خۆی پێ هەڵدەواسین، ئەوشتانەی من



حەز ناکەم باسیان بکەم. لە ناکاوێك چاوەکانم لە شتێك گیر بوون، لاگیرفانی یەکێك لەپالتۆکان سەرنجی ڕاکێشام، شتێکی تێدا بوو، گیرفانەکەی کەمێك بەرزکربووەوە، کەمێك لێی نزیك بوومەوە، بیرم کردەوە کە شتێکی شێوە لاکێشەیی تێدایە، لە شوونی هێلە دەرپەڕیوەکان دیار بوو کە ئەو گیرفانە چی لە خۆیدا حەشار داوە: کتێبێك! خەریك بوو ئەژنۆم بکەوێتە لەرزین: کتێبێك! چوار مانگی ڕەبەقە دەستم بەر کتێبێك نەکەوتووە، ئەندێشەی ئەوەی کتێبێکت لە دەست دایە و دەتوانیت تەماشای ریزی ووشەکانی بکەیت، دێرەکانی، بیری نوێ، بیانی، دەدۆزیتەوەو سەرنجت ڕادەکێشن، دەتوانیت بیانخەیتە ناو مێشکی خۆت، چاوەکانم هەندێك بە مەستی و هوییپنۆتیزەکراویەوە تەماشای گیرفانە دەرپۆقاوەکەیان دەکرد، ئەو کتێبە کە شێوەی گیرفانەکەی لە خۆیدا بەرجەستە کردبوو، بە شێوەیەك دەگەشایەوە، باسی ناکرێت. وەك ئەوەی گیرفانەکە بسووتێنێت و کونبەدەری بکات، تا ئەو ڕادەیەی چیتر نەمتوانی جلەوی ئارەزووم بگرم، بێ ئیرادە پاڵم بەخۆمەوە نا، خەیاڵی ئەوەی بەلای کەم لە گیرفانەکەوە دەستم بەر کتێبەکە بکەوێت، دەمارەکانمی لە تەوقی سەرمەوە تا بنی پێم وروژاندبوو. بێ ئەوەی بە خۆم بزانم، لە پاڵتۆکە نزیك کەوتبوومەوە. لە بە ختەوەریم پاسەوانەکەم ئاگای لە بزووتنەوەکەم نەبوو، لەوانەشە ئاگای لێ بووبێت، بەڵام بە شتێکی ئاسایی زانیبێت، دوای دوو سەعات وەستان، مرۆڤێك بیەوێت پاڵی خۆی بخاتە سەر دیوارێك. ئا لەو کاتەدا زۆر لە پاڵتۆکە نزیك کەوتبوومەوە، بە ئانقەست دەستەکانم خستبووە

پشتی خۆم، بۆ ئەوەی بیٚ سەرنجڕاکێشان دەستم بگاتە پاڵتۆکە. لەسەر گیرفانەکەوە دەستم بەر شتەکە کەوت، خۆ بە ڕاستی شتێکی لاکێشەییە، شتێکی کەمێك چەماوە، خششەیێکی کپی لێوە هات: کتێبێك!...کتێبێك! وەکو گوللە ئەو بیرە بە مێشکم داهات:"کتێبەکە بدزە!، بەڵکوو بتوانیت، ئەوسا دەتوانیت لە ژوورەکەتدا بیشاریتەوەو بیخوێنیتەوە، بیخوێنیتەوە، خۆ نەمردم جارێکی تر شت دەخوێنمەوە!" ئەو ئەندێشە هێشتان بەتەواوی بە مێشکمدا گوزەری نەکردبوو، وەکو ژەهرێکی بەهێز کاری لیٚ کردم، گوێچەکەکانم دەستیان بە سایەدبوون کردو دڵم کەوتە تەپە تەپ، دەستەکانم سارد هەڵگەڕابوون، گوێڕایەڵییان نەکرد، بەڵام دوای سڕبوونییەکەم هەندێکی تر بە هێواشی و بە ئاگاییەوە لە پاڵتۆکە نزیك کەوتمەوە، هەموو چاوەکانیشم بەسەر پاسەوانەکەوە بوو. دەستە شاراوەکانیشم لە پشتەوە لە ژێرەوە بەرەو سەرەوە بەرەو کتێبەکە دزەی دەکرد وهەڵدەگەڕا، پاشان: گرتنێك و ڕاکێشانێکی سووك و بە ئاگا. ئیتر هەر ئەوەندەم زانی ئەوە کتێبێکی بچووك و کەم لاپەڕە لە ناو دەستەکانم دایە. ئەوجا واگا هاتمەوەو ترسم لەم کارەم پەیداکرد. ناتوانم بیگێڕمەوە شوێنی خۆی، ئەدی چی لیٚ بکەم؟ لە پشتەوەڕا بۆ ناو پانتۆڵەکەم پاڵم پێوەنا، لەو شوێنەی قایش پانتۆڵی ڕاگرتووە، لەوێوەش وردە وردە بۆ سەرسمتەکانم، تا لە کاتی ڕۆیشتنی سەربازانەمدا بتوانم بە لێواری پاڵتۆکەم توند ڕایبگرم. ئێستا کاتی ئەزمایشە، خۆم لە عەلاگەی پاڵتۆکان دوورخستەوە، هەنگاوێك، دوو هەنگاو، سیٚ هەنگاو، باشە شتەکە سەرکەوتووەو دەکرێت. پاڵەپەستۆ بخەمە سەر قایشی پاڵتۆکە بەسە، بۆ ئەوەی کتێبەکە گیر بێت و نەکەوێت.

ئەوجا کاتی لیکۆڵینەوە هات. ئەو لێکۆڵینەوەشیان سەختترین لێکۆڵینەوە بوو، چونکە لە کاتی وەڵامدانەوە هۆشم بەلای قسەکانمەوە نەبوو، بەڵکوو هەموو بیری خۆم لەوە چڕکردبووەوە، کە کتێبەکە توند بگرم نەکەوێتە خوارەوە، بیٚ ئەوەی کەس هەستی پیٚ بکات. لە بەختەوەریم لێکۆڵینەوەکە ئەمجارەیان کەمی خایاند و توانیم کتێبەکە بە سەلامەتی بگەیەنمە ژوورەکەم ـ نامەویٚ بە وردەی چیرۆکی کتێب گەیاندنەکە بێزارت بکەم، چونکە هەر بۆ نموونە جارێك لە ناکاو و بە شێوەیەکی مەترسیدار لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکە لە ناو پانتۆڵەکەم خزیە خوارەوە، ناچار کۆکەیەکی توندم هێنا خۆم بۆ ئەوەی بتوانم خۆم بچەمێنمەوەو دووبارە کتێبەکە بخەمەوە ژێر قایشەکەم- بەڵام ئای ئەوە چ چرکەیەکی خۆشی بەخشی ژیانم بوو، کاتیٚ گەڕامەوە ئەشکەوتەکەم و، ئیتر چیتر لەویٚ تەنها نەبووم!

---

ئێستا لەوانەیە ئێوە وا بیر بکەنەوە، یەکسەرە من پڕم دابێتە کتێبەکەو تەماشام کردبێت و دەستم کردبێت بە خوێندنەوەی! بێگومان وا نەبوو! جاریٚ ویستم تامە بەراییەکەی لیٚ وەربگرم، من خاوەنی چ کتێبێکم؟ بۆ ئەوەی دەمارەکانم پتر تامەزرۆ بن و چێژی پتر لەم خەونە وەربگرن و پتر بوروژێن، بە ئانقەست دەرهێنانی کتێبەکەم دوا خست و کەوتمە بیرکردنەوە، پتر لە هەموو شتێك حەز دەکەم ئەو کتێبە دزراوە چ جۆرە کتێبێك بێت: بەر لە هەموو شتێك حەز دەکەم ئەو کتێبە لاپەڕەکانی بەچڕی

چاپکرابن و ژمارەیان زۆر بێت و ژمارەیێکی زۆر زۆر تەنك، بۆ
ئەوەی پتر کەرەسەی خوێندنەوەم هەبێت. پاشان ئارەزووی
بابەتێك دەکەم، بابەتێك کە مێشکم خەریك و خەستە بکات، سادە
نەبێت، ئاسان نەبێت، بەڵکوو شتێك بێت مرۆڤ بە فێربوونیەوە
خەریك بێت، بشتوانێت ئەزبەری بکات، هۆنراوە! لە هەموانیش
باشتر *ئای کە خەونێکی چەندە خۆشە!* هۆنراوەی (گۆتە) یان
هی(هۆمێر) بن. بەڵام ئیتر نەمتوانی زۆرتر جلەوی مەراق بگرم و
لە ئاکامدا بە پاڵکەوتنەوە لەسەر قەرەوێلەکە، بە شێوەیەك ئەگەر
پاسەوانەکە لە ناکاو دەرگا بکاتەوە، هەست بە شتەکە نەکات،
کتێبەکەم لە ژێر قایشەکەم ڕاکێشا دەرەوە.

یەکەم تەماشاکردنی کتێبەکە هیوابڕاوییێکی گەورە بوو بۆ من،
بگرە تووڕەبوونێکی تفت و تاڵ بوو: ئەو کتێبە کە بەو مەترسییە
گەورەیەو بەو هەموو هیواو ئاواتە گەشانە کەوتبووە دەستم،
بریتی بوو لە کتێبێکی پڕ [illegible]تەی یارییەکانی سەدو پەنجا



یاری پاڵەوانانی شەترەنج، نەحەر دەرگاو پەنجەرەی ژوورەکەم
دانەخرابان، ئەوا لە یەکەمین تووڕەبوونمدا تووڕ هەڵمدەدایە
دەرەوە. چونکە چیم لەو کتێبە بێ وشەیە کردبایە؟ لەو
سەردەمانەی لاو بووم، لە سەردەمی ئامادەیی، وەکو زۆربەی
خەڵکی تر لە کاتی بێزاری جاربەجار یاریم بە شەترەنج دەکرد،
بەڵام چی لەگەڵ ئەو کەرەسە بێردۆزییە بکەم؟ خۆ یاری شەترەنج
بە بێ کەسێکی بەرامبەر و بەبێ تەختەو بەردی شەترەنج هەر
ناکرێت! بێ هیواو بە بێزاری لاپەڕەکانی کتێبەکەم هەڵدەدایەوە،
بە ڵکوو شتێکی تێدا بدۆزمەوە کە بخوێندرێتەوە، پێشەکییێك،

ڕانماییێك" بەڵام جگە لە خشتەی ڕووتی چوارگۆشەیی و هێماوی
یاری پاڵەوانانی شەترەنج، ئەو هێمایانەی کە هێشتان بۆ من
ماناییێکیان نەبوو، چیتری تێدا نەبوو a2- a3- f1- g3 ...تا دوایی.
هەمووی بۆ من وەکو هێمای جەبری دەردەکەوتن، نەمدەتوانی
شتێکییان لێوە دەست پێ بکەم. پاشان وردە وردە بۆم دەرکەوت
کە a,b,c ئاماژەن بۆ هێڵە ستوونییەکانی تەختەی شەترەنج و
ژمارەکانیش لە 1 وە بۆ 8بریتین لە هێڵە ئاسۆیییەکان و شوێنگەی
بەردەکانی شەترەنج دیاری دەکەن" بەوەش شێمای زمانێکی
وێنەیی هاتۆتە ئارا، زمانێك! هەر باشە. بیرم کردەوە، بەڵکوو
بتوانم بۆ خۆم جۆرێك لەتەختە شەترەنج دروست بکەم. ئەوجا بە
یارییەکانی ناو کتێبەکە دابچمەوە" هەر دەتگوت پەڕجووێکی
ئاسمانییە، کاتێ تەماشام کرد دەبینم نەخشەی سەر چەرچەفی
تەختەکەم هەموو هێڵکاری ئاسۆیی و ستوونیە و، ئەگەر
بەشێوەیەکی گونجاو دەقی بک[illegible] ئەوا شەست و چوار خانەت لێ



بەدەست دەکەوێت. لاپەڕەی یەحەمی کتێبەکەم پچڕاندو کتێبەکەم
لە ژێر دۆشەکەکەم شاردەوە. پاشان دەستم کرد بەوەی لەو پارچە
نانە خواروخێچانەی لام مابوونەوە، بەردەکانی شەترەنج دروست
بکەم، بەڵام چ بەردێك، خواروخێچ و نیوەچڵ و سەیر و سەمەر،
پاشا، شالیار، تا دوایی، هەموویم دروستکردن" دوای
ماندووبوونێکی زۆر توانیم هەموو بەردەکان بە پێی خشتەی سەر
لاپەڕەکە بخەمە شوێنگە[illegible]یان. بەڵام کاتێك ویستم بە



هەنگاوی یارییەکەدا بچمەوەو ڕەواوی یارییەکە وازی بکەم، ئەو
بەردە ناڕێکوپێکانەی کە نیوەیانم بە تۆزو خۆڵ بۆر کردبوو، بۆ

ئەوەی لێکیان جیابکەمەوە، بە تەواوی سەریان لێ شێواندم و لە
هەولەکەم سەرنەکەوتم. لە رۆژی یەکەمدا سەرم گێژ بوو، بەڵام
کۆڵم نەدا" پێنج جار، دە جار، بیست جار، یارییەکەم لێ
تێکدەچوو و دەبووایە سەر لە نوێ لە سەرەتاوە دەست پێ
بکەمەوە. بەڵام کێ لەسەر ئەو زەمینەدا بە قەد من کاتی بێ سوود
و بەکارنەهاتووی هەبوو، من دیلی دەستی هیچ بووم، کێ بە قەد
من خاوەن سەبر و تامەزرۆ بوو؟ لە دوای شەش رۆژان توانیم بێ
گازەندە لە خۆم یارییێك تا کۆتایی ببەم، لە دوای هەشت رۆژی تر
تەنانەت چیتر پێویستم بەوە نەبوو ئەو بەردە خوارو خێچانە
بخەمە سەر چەرچەفەکە، بۆ ئەوەی تێبگەم شوێنگەی بەردەکان بە
پێی کتێبەکە لە کوێن، دوای هەشت رۆژی تریش پێویستم بە
چەرچەفیش نەما" بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیك هێما
نابەرجەستەکانی کتێبەکە a1 ,a2, c7, c8 لەبەرچاوم جەستەیان
دەگرت و شوێنگەکانیانم بە تەنداری دەدیت. بێ کەموکورتی و بێ
هەڵە ئەو گۆڕانکارییە ڕووی دەدا، تەختەی شەترەنج و بەردەکانیم
لە مێشکی خۆمدا نەخش کردبوو، بە هۆی فۆرمە ڕووتەکانیش
شوێنی هەربەردێکم دیاری دەکرد، هەر وەك مۆسیقاژەنێکی
خاوەن ئەزموون، کە ئەوەندەی بەس بێت تەماشای نۆتەنامەکەی
بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت گوێی لە تەواوی دەنگوئاوازەکان ببێت.
دوای چواردە رۆژی تر ئیتر بێ خۆماندووکردن دەمتوانی هەر
یارییێکی کتێبەکە بە ئەزبەری یاری بکەمەوە، یان وەك
شەترەنجناسەکان دەڵێن، دەمتوانی یارییەکان کوێرانە یاری
بکەمەوە" ئێستا دەزانم کە دزییە ناشیرنەکەم چ سوودێکی



گەورەی بۆ من هەبوو، چونکە لە هیکرا بووم بە خاوەنی کارێك،
تۆ بڵێ ئەگەر حەز دەکەیت، کارێکی بێ ماناو بێ مەبەست، بەڵام
کارێك کە هیچەکەی دەوروبەری منی کردە هیچ و لە ناوی برد. من
خاوەنی سەد و پەنجا گەمەی پێشبڕکێی پاڵەوانەکان بووم و
ئەوەش بۆ من چەکێکی پەڕجوودار بوو لە دژی ئازاری باری
مۆنۆتۆناوی ژوور و کات. بۆ ئەوەی ڕێگا نەدەم چێژی ئەو
خەریکبوونە نوێیەم کۆتایی بێت، گەمەکانم بە وردی دابەش
کردبوو، بەیانییان دوو گەمە، دوای نیوەڕۆ دوو گەمە، ئێوارنیش
دووبارەکردنەوەیان بەخێرایی. بەو جۆرە رۆژێکم بەسەر دەبرد،
ئەگەر وا نەبووایە رۆژەکان وەکو لاستیك درێژ دەبوونەوە، بەڵام
من بێ ئەوەی ماندوو ببم، خۆم خەریك کردبوو، چونکە لایەنێکی
زۆر باش لەو یارییەدا هەیە، وزەی بیرکردنەوەی مرۆڤ هەمووی لە
خانەیەکی تەنگ و بچووك چڕ دەبێتەوە، جا هەرچەند بیربکەیتەوە
مێشکت خاو نابێتەوەو بە پێچەوانە مێشك زاخاو دەدرێتەوەو هێز
و چالاکی کاریگەرتر دەبێت. وردە وردەش دووبارەکردنەوەی
میکانیکی یاری پاڵەوانەکان، بەرەو تیگەیشتنێکی هونەرمەندانەی
خۆشیبەخش دەچوو. من فێری ئەوە بووم لە وردەکارییەکانی
هێرش و بەرگرییە توند و تیژ و فێڵاوییەکان بگەم، من شارەزای
تەکنیکی ئەوە بووم، کە بەر لە هەنگاوەکان بیربکەومەوەو
پێشبینی ئەنجامەکان بکەم، فێری پێڕکردنی هەنگاوەکانی یاری
و دووبارە چوونەوە سەر شوێنگەی سەرەتایی بەردەکان بووم،
هەر زوو شارەزای ئەوە بووم بە پێی ڕێبازی یارییەکان، بە بێهەڵە
پاڵەوانەکان بناسمەوە، وەك چۆن پیاو بتوانێت بە بیستنی چەند

دێری شیعریێ، بزانێت شیعری کام شاعیره“ ئەو خەریکبوونەم کە هەر بۆ پڕکردنەوەی کات دەستم پێ کردبوو، بۆم بوو بە چێژ و پێکهاتەی پاڵەوانە گەورەکانی شەترەنج، وەك ئالیێچین، لاسکەر، بۆگۆژۆبۆڤ، تارتاکۆڤەر، هەموو وەکو کۆمەڵێك دۆستی خۆشەویست لە ژوورەکەم کۆببوونەوە. ئەو گۆڕانکارییە بێ سنوورەی کە هەموو ڕۆژێك کونجە کپ و لارەکەمی ئاوەدان دەکردەوەو ئەو هەڵسوکەوتە ڕێك و بەرنامەدارەی خۆم، بە دڵنیاییەوە دووبارە بەهرەی بیرکردنەوەیان پێدامەوە، ئەوبەهرەیەی کە پێشتر لییان تێکدابووم: بەو بیرکردنەوە بە زەبت و ڕەبت پێڕەوداره هەستم دەکرد مێشکم زاخاو دەدرێتەوە. بە تایبەت لەکاتی لێکۆڵینەوە هەستم بەوە دەکرد کە چڕ و ڕۆشن بیردەکەمەوە، خۆم لەسەر تەختەی شەترەنج دەدیتەوەو بەرامبەر هەڕەشەی وەقەبازانەو داوە شاردراوەکانیان بەرگریم لە خۆم دەکرد“ ئیتر چیتر لە لێکۆڵینەوەکان خۆم بە لاواز نەدەزانی وهەستیشم بەوە دەکرد، کە پیاوەکانی گێستاپۆ ڕێزێکم لێ دەنێن. سەبارەت بەوەی دەیاندیت کە ئەوانەی تر هەموو یەك لە دوای یەك هەرەس دەهێنن و خۆیان بەدەستەوە دەدەن، لەوانەیە خۆیان لە خۆیان پرسی بێت، دەبێ ئەوهێزی بەرگریکردنە لە بن نەهاتووەی من لە چ سەرچاوەیەکەیەوە هەڵهێنجرابێت.

ئەو کاتی بەختەوەرییەم، کە تێیدا ڕۆژ بە ڕۆژ بە شێوەیەکی بەرنامەرێژی سەدوپەنجا یاری ناو کتێبەکەم یاریدەکردەوە، نزیکە دوو مانگ و نیو تا سێ مانگی خایاند. پاشان بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕووی خاڵێکی مردوو

---

بوومەوە. لە ناکاوێك دیسان بەرامبەر هیچەکە خۆم دیتەوە، چونکە لە دوای ئەوەی هەر گەمەیەکم بیست سی جاێك دووبارە کردبووەوە، ئیتر هیچ چێژ و تامی نوێیاتی و هێزی ڕووداوبەخشینی پێوە نەمابوو، هێزی وروژاندن و ختوکەدان وهێزی سەرنجڕاکێشییان چکی کردبوو. چ مانایێکی هەبوو گەمەیەك دووبارە بکەمەوە، کە دەمێك بوو هەنگاو بە هەنگاوی گەمەکەم بە ئەزبەری و وەك ئاو خواردنەوە دەزانی؟ هەر کە دەمویست گەمەیەك دەستپێبکەم، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیك هەنگاوەکانی گەمەکە لە مێشکمدا چەخماخەیان دەداو گلۆر دەبوونەوە، هیچ ڕووداوێکی لەناکاو، یان مەراق وکێشەیەکییان پێ نەدەبەخشیم. پێویستم بە کتێبێکی تر هەبوو، کە گەمەی تری تێدا بووایە، بۆ ئەوەی بتوانم خۆمی پێ خەریك وسەرگەرم بکەم. بەڵام چونکە ئەوەش شتێکی نەکردەو مەحال بوو، تەنها تاکە ڕێگاییێك هەبوو، کە بتوانم پێیدا خۆم لەو گومڕاییە دەربازبکەم: پێویست بوو لە جیاتی یاریکەرەکانی پێشوو، یاریکەری تر بدۆزمەوە“ پێویست بوو، هەولی ئەوە بدەم لەگەڵ خۆم، یان باشتر لە دژی خۆم یاری بکەم.

ئێستا نازانم، تا چ ڕادەیەك جەنابت بیرت لە دووبارەکردنەوە یارییەکان کردۆتەوە. بەڵام لەوانەیە بیرکردنەوەیەکی سەرپێیی بەس بێت، بۆ ئەوەی بزانیت، کە لە یاری شەترەنج دا، ئەگەریش یارییەکە ڕێکەوتئاسا دەستی پێ کردبێت، ئەوا هەر شتێکی بێ ماناو ناماقووڵە، ئەگەر دژی خۆت یاری بکەیت. تام و چێژ و هێزی سەرنجڕاکێشی شەترەنج تەنها لەوەدایە، کە ستراتیجەکەی

لە دوو مێشکی جیاوازدا سەرهەڵدەداو دەچێتە پێشەوە، لەو جەنگە بیرییەدا ڕەش دەرك بە مانۆڕەکانی سپی نابات و، بەردەوام هەوڵی هەڵهێنانیان دەدات بۆ ئەوەی ڕێگایان لێ بگرێت، سپییش لە لای خۆیەوە هەولی بەزاندن و بەربەستکردنی مەبەستە نهێنییەکانی ڕەش دەدات . بەڵام کاتێك ڕەش وسپی هەمان تاکە کەس بن، ئەوا ئەو بارە ، نەگونجاوە دێتە ئارا، کە ئەو هەمان مێشکە لە یەك کاتدا ئەو شتە دەزانێ کە پێویستە نەیزانێ، تا بتوانێت لە جیاتی سپی بەرامبەر یاریت لە دژدا بکات و لەفەرماندان دا بە تەواوی ئەو شتە لەبیربکات، کە پێش خولەکێك نیاز و مەبەستی ڕەش بوو. لە ڕاستیدا مەرجی ئەو دووجار بیرکردنەوەیە، دوو لەت بوونی تەواوی خودی مرۆڤەو، توانای پێکردن و داگیرسانی مێشکە وەك ئامێرێکی میکانیکی" یاریکردنی شەترەنج لە دژی خۆت، واتە بوونی ئەودوو دژایەتییە لە ناوە خۆت، وەکو ئەوەی کە بەسەر سێبەری خۆتدا باز بدەیت.

---

بۆ ئەوەی قسەکەی خۆم بە کورتی دەربڕم، من لەو ناچارییەدا چەند مانگێك هەولم بۆ ئەو شتە مەحال و بێ ماناو پێکەنیناویە دەدا. بەڵام من چارەیەکی ترم نەبوو جگە لەو بارە نالەبارە، بۆ ئەوەی نەکەومە داوی داهێزرانی بیر وجەستەو تووشی شێتی نەبم. بە هۆی ئەو بارە سامناکەی کە تێی کەوتبووم، ناچار بووم بەلای کەم هەوڵی ئەو دوولەتکردنەی خۆم بدەم، لەتی منی ڕەش ولەتی منی سپی. بۆ ئەوەی ئەو هیچە دڕندەیەی دەوری دابووم تەنگم پێ هەڵنەچنێت".



(دکتۆر بی) خۆی کێشایەوە ناو قەرەوێلەکەی و خولەکێك چاوی خۆی قوچاند. وەك ئەوە وا بوو، کە بیەوێت بە زۆر بەسەر بیرەوەرییێکی تاڵ زاڵ ببێت. دیسان لێوەلەرە سەرنجڕاکێشەکەی، کە دەسەڵاتی بەسەردا نەدەشکا، گۆشەی چەپی دەمی گرتەوە. ئەوجا کەمێك خۆی لەسەر قەرەوێلەکەی راستکردەوە.

"ئاوا– هیوادارم هەتا ئێرە توانیبێتم هەندێکی هەموویم بۆ ڕۆشن کردبیتەوە. بەڵام بەداخەوە، دڵنیا نیم لەوەی کە دەتوانم ئەوانەی دواییشت ئاوا بۆ بخەمە بەرچاوان. چونکە ئەو خەریکبوونە نوێیە پێویستی بە شەتەکدانی مێشك هەبوو، بە شێوەیەك کە هەموو شێوە خۆکۆنترۆلکردنێکی کردبوو بە مەحاڵ. من باسی ئەوەم بۆ کردی، کە بە باوەڕی من، ئەو کارە خۆی لە خۆی شتێکی ناماقوڵ و بێ مانایە تۆ دژی خۆت یاری شەترەنج بکەیت، بەڵام ئەو شتە ناماقوڵەش شانسێکی دەبوو، ئەگەر تەختە شەترەنجێکی ڕاستیم لەبەردەست بووایە، چونکە بە هۆی راستەقینایەتی تەختە شەترەنجێك هەر نەبێ هەندێك دووری، سەربەخۆیاتی ماددی دەهاتە ئارا، بەرامبەر تەختە شەترەنجێکی ڕاستی، بە بەردە شەترەنجی ڕاستی، مرۆڤ دەکارێت پشووی بیرکردنەوە بدا بەخۆی، هەر نا مرۆڤ دەتوانێت بە جەستەوە لە لاییێکەوە بچێتە لاکەی تری مێزی یاری، بەوەش لە ڕوانگەی ڕەشەوە بۆ سپی بچێت. بەڵام من بە ناچاری، وەك کە ناچاربووم، ئەو جەنگانەم لە دژی خۆمدا، یان ئەگەر دەتەوەێ، لەگەڵ خۆمدا هەڵگیرساندبوو، من ناچاربووم لە ژوورێکی خەیاڵیدا شەست و چوار خانە بە ڕۆشنی ڕابگرم، سەرەڕای ئەوەش نەك هەر لە

هەڵکەوتەو شوێنگەی ساتەوەختی بەردەکان، بەڵکوو دەبوایە لێکدانەوە بۆ جووڵەکانی داهاتووی بەردەکانی هەردوو یاریکەر بکەم. بەڕاستی من دەزانم ئەوە چەند ناماقوڵ دێتە بەرچاوان، خەیاڵی شەش کەرەتی، هەشت کەرەتی، دوازدە کەرەتی، بۆ هەردوو منەکەم، منی ڕەش و منی سپی، وە بەردەوامیش چوار پێنج هەنگاوی پێشبینی. ببوورن لێم، کە بیری ئێوەشم تووشی ئەو خەیاڵە شێتانەیە کردووەو سەرتان دەیەشێنم، من ناچار بووم لەو ژوورە نابەرجەستە خەیاڵییە وەك یاریکەری سپی لە بەرایییەوە لێکدانەوە بۆ چوار پێنج هەنگاوی داهاتووو بکەم، هەروەها وەك یاریکەری ڕەشیش، واتە تێکڕا لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەدا تا ڕادەیەکی دیاریکراو پێویست بوو بە دوو مێشك بیر بکەمەوە، مێشکی سپی و مێشکی ڕەش. بەڵام خەتەرناکترین لایەنی ئەو ئەزماییشە ناماقووڵە خودی ئەو خۆدابەشکردنە نەبوو، بەڵکوو ئەو وڕو کاس بوونە بوو  کە لە ئەنجامی جێگۆڕکێی بەردەوام لە نێوان هەردوو بیرکردنەوەی هەردوو لایەندا تێی دەکەوتم. دووبارەکردنەوەی ڕووتی یاری پاڵەوانەکانی جیهانی، کە لە هەفتەکانی پێشووتر خۆم پێوە خەریککردبوون، تەنها بریتی بوون لە بەرهەمهێنانەوەی بەرهەمهاتووەکان، لە دووبارەکردنەوەی ئەو کەرەسانەی کە خۆیان لە ئارادا هەبوون، ئەوە کارێکی ئەوەندە دژوار نەبوو، وەك ئەزبەرکردنی هۆنراوە بوو، یان لەبەرکردنی پەرەگرافەکانی یاسا، ئەوە کارێکی سنوور و بەرنامەدار بوو، بۆیەشە ئەوە مەشقێکی زۆر باشیش بوو بۆ هێزی بیرکردنەوە. بەیانی یاری دوو پاڵەوان، دوای نیوەڕۆش دووی تر، ئەمە کارێکی دیاریکراو بوو، بەبێ هیچ سەختییێك بەئەنجامم دەگەیاندن، بریتی بوو لە سەرگەرمییێکی ئاسایی، کاتێك لە یارییەکاندا، لە هەنگاوەکانیان هەڵەیەکم بکردبایە، یان لە یادم بچووبایە هەنگاوی دوایی چییە، کتێبەکەم لا بوو، دەمتوانی تەماشای بکەم. ئەو کارە وەك هەتوان بوو، دەمارە داهێزراوەکانی ئارام دەکردمەوە، چونکە لە دووبارەکردنەوەی یاری کەسانی تر، پێویستی بەوە نەدەکرد خۆم تێکەڵی کێشەی یارییەکان بکەم" ڕەش یان سپی سەردەکەوت، بۆ من وەکو یەك بوو، ئەوە ئالێخین یان گۆلیۆبۆۋ بوون کە بۆ کەمەرەی سەرکەوتن دەجەنگین، کەسایەتی تایبەتی من، مێشکم، گیانم، تەنها وەکو بینەرێك، وەکو ناسەرێکی بەهرەو جوانییەکانی ئەوان، چێژیان لە گەمەکان وەردەگرت. بەڵام لەو کاتەوە کە هەولی ئەوەم دەدا دژی خۆم یاری بکەم، بێ ئەوەی بەخۆم بزانم، شانی خۆم خستبووە ژێر بارەکە، هەر یەك لە دوو منەکەم، منی ڕەش و منی سپی، وەکو دوو لایەنی پێشبڕکێی شەیدا دژایەتی یەکتریان دەکرد و هەر یەك بێ پشوو، بێ ئارامی، کەوتبوونە تەماحی سەرکەوتنی خۆیان" تەماحی بردنەوە" دوای جووڵەی هەر بەردێك وەك منی ڕەش تا دەیگرتم، بە مەراقی ئەوەی کە دەبێت منی سپی چ هەنگاوێك بهاوێت، کە منێکم هەڵەیەکی دەکرد، منەکەی ترم هاواری خۆشی لێ هەڵدەستاو،  ئەوەی تریش ڕەنجی بەدبەختی دەکێشا.

ئەوە هەموو وەکو شتێکی بێ مانا دێتە بەرچاو، جا بەڕاستی شیزۆفرینیاییێکی ئاوا دەستکرد، دابەشکردنێکی ئاوهای دەماغ،

بەو هەڵچوونە مەترسیدارە، لەمرۆڤێکی ئاسایی و لە بارێکی ئاساییدا، شتێکە ناتوانرێت بهێنرێتە بەرچاوان. بەڵام جەنابتان ئەوەتان لە بیر نەچێت، من بە زۆری زۆرداری لە هەموو ئاساییاتییەك پچڕێنرابووم، زیندانییێکی بێ گوناهی یەخسیر بووم، چەند مانگ بوو بە تەنهاییێکی ورد نەخشە بۆ کێشراو دەچەوسێنرامەوە، مرۆڤێك بووم کە دەبووایە ڕق و تووڕەیی پەنگاوخواردووی خۆم بە شتێك دەربڕم. جا چونکە شتێکی ترم نەبوو جگە لەو یارییە ناماقووڵەی دژ بە خۆم، ئەوا هەموو تووڕەیی خۆمم، هەموو بیری تۆڵەم، بێ بەزەییانە خستبووە سەر ئەو یارییە. شتێك لە ناوەوەم دەیەویست هەق بدات بەخۆی، بەڵام تەنها منەکەی ترم هەبوو کە بتوانم ململانێی لەگەڵدا بکەم“ بۆیەشە لە کاتی یاری تووشی هەڵچوونێکی نزیکە کینەدار دەبووم. لە سەرەتاوە بە تێبینی وئارامی بیرم دەکردەوە، لە نێوان یارییەکان پشووم دەدا بەخۆم، تا خۆم لە خەستەیی ڕزگار بکەم“ بەڵام وردە وردە دەمارە ڕووشاوەکانم ماوەی چاوەڕوانیکردنیان نەدەدام، هێشتان منی سپی بەردێکی بە تەواوی نەدەجووڵاند، منی ڕەش هەڵپەی هاتنە پێشەوەی بوو، هێشتان یارییێك بە تەواوی کۆتایی نەدەهات، بە ناچاری خۆم بۆ یارییێکی تر تەیار دەکرد، چونکە هەموو جارێك یەکێك لە کش-منەکان لەلایەن ئەوەکەی تر دەبەزێنراو داوای تۆڵەی دەکردەوە. هەرگیز بە نزیکەییش ناتوانم پێتی بڵێم لە ئەنجامی ئەو شێتایەتییە سەیرەو تێرنەبوون لە یارییە، لەو مانگانەی دوایی کونجی زیندان چەند یاریم لەدژی خۆم کردووە، لەوانەیە هەزارو پتریش. ئەوە



شێتایەتییەك بوو، کە نەمدەتوانی خۆمی‌لێ بپارێزم“ لە بەیانییەوە تا شەو من جگە لە ئەسپ و سەرباز وقەڵاو پاشاو ئا و بێ و سێ و کش مەلیك و جێگۆڕکێی قەڵاو پاشا (ڕۆخاد) پتر بیرم لە شتێکی تر نەدەکردەوە. بە هەموو هەست و بوونی خۆمەوە ڕووچووبوومە ناو خانەکانی شەترەنج. خۆشی یارییەکەم لێ بوو بە حەز، حەزەکەم لێ بوو بە خوو، بوو بە خووێکی خۆسەپێنەر، بوو بەکینەیەکی بە هەڵپەو تەنگەتاوی وا کە نەك هەر کاتەکانی واگایی لێ داگیردەکرم، بەڵکوو وردە وردە تەنگی بە کاتەکانی خەویشم هەڵدەچنی. من دەمتوانی تەنها بیری شەترەنجی بکەمەوە، تەنها بیر لە جوولە شەترەنجییەکان، لە کێشەکانی شەترەنج“ هەندێ جار بە تەوێلێکی شێدار واگا دەهاتم، دەمزانی تەنانەت لە کاتی خەویشدا، بێ ئەوەی بەخۆم بزانم، شەترەنجم یاری کردووە، ئەگەریش خەونێکم بە مرۆڤێك بدیبایە، ئەوا لە خەونەکەمدا ئەو مرۆڤە تەنها وەکو ئەسپ و قەڵای شەترەنج لە جووڵەدابوون، لە چوونە پێش و پاش و بازدان. ئەو کاتەش کە بانگیان دەکردم بۆلێکۆڵینەوە، چیتر لە ئاستی ئەوەدا نەبووم بە لێپرسراوییەوە بەرامبەر خۆم بیربکەمەوە“ دەبێت لە لێکۆڵینەوەکانی دوایی بە شێوەیەکی نزیکە پەرتاوی قسەکانی خۆم دەربڕیبێت. چونکە لێکۆڵەرەوەکان بەچاوێکی نامۆ تەماشایان دەکردم، لە ڕاستیدا ئەو کاتەی ئەوان پرسیارەکانیان بەرەو ڕوو دەکردم و، ڕاوێژیان لەگەڵ یەکتری دەکرد، من پەڵەی ئەوەم بوو، هەرچی زووتر بمگەڕێننەوە کونجی تەنهاییەکەی خۆم و بگەڕێمەوە بۆ لای یارییەکەی خۆم و، بەردەوام بم لە یارییە

شـێتانەکەی خـۆم، گەمەیـەکی تـر و، یـەکێکی تـر و، یـەکێکی تر...هـەموو داپچڕانێکم لـە یاری بـۆ مـن ئازاردانێك بـوو. تەنانـەت ئـەو چارەگە کاتـژمێرەی کـە چاودێرانی زینـدان ژوورەکـەیان پـاك دەکردمەوە، یان ئەو دوو خوولەکەی خواردنیان بۆ دەهێنام، بێـزار وهەراسانیان دەکردم، هەندیٚ جار لەگەنی خواردنەکـەم وەك خـۆی دەمایەوە، بیٚ ئەوەی دەستی بۆ بەرم. ئەوەی جەستەم هەستی پیٚ دەکرد، تەنها تێنوێتییێکی سامناك بوو“ دەبێـت هـۆی ئـەوەش تـای ئەو بیرکردنـەوە بەردەوامـەو ئـەو یارییـە بـیٚ کۆتاییـە بـوو بێـت“ بـە دوو بێن لیترێك ئاوم دەخواردەوە، داوای ئاوی تـرم لـە چاودێرەکە دەکرد، بەڵام هەندی یەکودەم دووبارە زمـانم لـە مەڵاشوومدا وشك دەبووەوە. تـا وا لـیٚ دەهـات لـە کـاتی یارییەکـە پـتر هەڵدەچووم و، لەبەیانیـەوە تـا شـەو جگـە لـە یـاری شـتێکی تـرم نـەدەکرد، بەشـێوەیەك نەمـدەتوانی بـۆ چـرکەیەکیش ئـارام دابنیشـم“ لـە کاتێکدا بیرم لە هەردوو لاکان دەکردەوە، بیٚ پچڕان دەچوومە سـەر و دەهاتمە خوار، هەمیشە خێراتر و خێراتر و خێراتـر، سـەرکەوەو دابـەزە، بـڕۆ سـەر و وەرە خـوار، سـەرکەوەو دابـەزەو جـار لـە جـار گـەرمتر، هەرچـەند کـاتی بڕیـاری بـراوەو دۆڕاوی لایەنـەکان، نزیـك دەکەوتەوە، تـەماع بـۆ بردنـەوە، بـۆ سـەرکەوتن، سـەرکەوتن بەسـەر خۆمـدا، دەبـوو بـەجۆرە رقێـك، لەبـەر بـیٚ سـەبری هـەموو جەسـتەم دەکەتـە لـەرز، چـونکە هەمیشـە یـەکێك لـە منـە شـەترەنجەکان بـۆ ئـەوەی تریـان زۆر هێـواش دەجولایـەوە. یـەکێکیان ئـەوەی تـری تـەنگاو دەکرد“ لەوانەیـە جـەنابتان پێکـەنینتان پـیٚ بێـت، وای لـیٚ دەهات دەستم دەکرد بەوەی جنێو بەخۆم بـدەم: کاتێـك یـەکێك لـە منەکان شان بە شانی ئەوەی تر نەجولابا هـاوارم لـیٚ هەڵدەستا: " زووتر، زووتر!" یان:" دەی بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە!" . بیٚ گومـان ئێستاکیٚ کە بیری لـیٚ دەکەمـەوە، بـۆ مـن رۆشـنە، ئەو بارەی منی تێـدابووم، بـیٚ ئـەملاو ئـەو لا، جـۆرە نەخۆشـییێکی ڕووشـانی لـە رادەبـەدەری مێشـك بـوو، ئـەو نەخۆشـییەی کـە تـا ئـەو کاتـە لـە نەخۆشـیزانی و پزیشـکی نەناسـرا بـوو، وە مـن نـاتوانم جگـە لـە نەخۆشـی: ژەهراوبـوونی شـەترەنجی، نـاوێکی تـری بۆ دابنـێم. لـە کۆتاییـدا ئـەو شـێتاتییە یەکلاییـە سنووری مێشکیشـی بەزانـدم و دەستی پیٚ کرد جەستەشی دەگرتمەوە. دەستم بە لاوازبوون کرد، بە نا ئارامی و ئالۆزی دەنووستم، بە گرانـی واگـا دەهـاتم بـە زۆر چـاوەکانی خـۆم دەکـردەوە، هەنـدیٚ جـار ئەوەنـدە هەسـتم بـە بێهێـزی دەکـرد، بـە زۆر و بـە دەسـتێکی لـەرزۆك بـەرداخێك ئـاوم دەگەیانـدە لێـوی خـۆم، بـەڵام هـەر گەمـە دەسـتی پـیٚ دەکـرد و نەدەکرد، هێزێکی وەحشـەتناك دەکەوتـە ناوجەستەم: دەستەکانم مستکۆڵەدەبوون و دەکەوتمـە دابـەزین و سـەرکەوتن. وەك تـەمێکی سوور هەندیٚ جار گوێم لە دەنگی خۆم دەبوو، بە دەنگێکی کـەرخ و کینەدار بەسەر خۆمدا دەمشیڕاند:"کش مەلیك"، یان "مات".

چۆن چۆنی ئـەوبارە سـامناك و بـیٚ وەسـفە کەوتـە قـەیران، حـەز ناکـەم خـۆم باسـی بکـەم. ئـەوەی مـن لـەو بـارە دەیـزانم، ئـەوە بـوو، بەیانییـەك لەخـەو واگـا هـاتم، ئەوە جۆرە واگاهـاتنێکی وەك رۆژان نەبوو. جەستەم بە تـەواوی داهێزرابوو، بە نـەرمی و ئاسـوودەیی راکشـابووم. خەسـتەییێکی خەسـت و قـوولٚ کـەوتبووە سـەر پشتەچاوەکانم، خەستەییێکی وا چـەند مانگێـك بـوو هەسـتم پـیٚ

نەکردبوو، بە گەرمی و ئاسوودەیی کەوتبووە سەر پشتی چاوەکانم، بەجۆرێك نەمدەتوانی بڕیاری چاوکردنەوە بدەم. چەند خولەکێك وا مامەوەو چێژم لەو بارە وەردەگرت، لەو راکشانە گەرم و هەستە سڕبووەم. لە ناکاو وەك ئەوە وا بوو گوێم لە دەنگە دەنگێك بێت لە پشتی سەرمەوە، دەنگێکی زیندووی مرۆڤ، وشە دەهاتنە گوێم، جەنابتان ناتوانن هەستی راجفرانەکەم بێننەوە بەرچاوی خۆتان، چونکە چەندان مانگ بوو، نزیکە ساڵێك بوو، جگە لە قسە رەق و تیژو بە تەوسەکای حاکم، نی گوێم لە دەنگێکی تر نەبوو. "ئەوە تۆ خەون دەبینیت" بە خۆمم گوت. "تۆ خەون دەبینیت! نەکەی چاو بکەیتەوە، لێ گەڕێ با خەونەکەت درێژە بکێشێت، دەنا دیسان خۆت لە کونجە نەفرەتلێکراوەت دەبینیتەوە، دیسان کورسی و مێز و کاغەزدیوارییە نەخشە هەتا هەتاییەکەت بەرامبەر دەبێتەوە، تۆ خەون دەبینیت، خەون ببینە بۆخۆت!"

بەڵام مەراق بەسەرمدا زاڵ بوو. هێواش هێواش چاوەکانی خۆم کردەوە: ئەمە چ پەڕجووێکە: ئەوە ژوورێکی تر بوو، منی تێدا بووم، ژوورێکی تری بەرینتر، رێکوپێکتر لە ژووری هوتێلەکەم. لە پەنجەرەیەکی بێ تەڵبەند رۆناکی دەهاتە ژوورەوە، دیمەنی درەختی لێوە دیار بوو، درەختی سەوز و لەراوەی بەربا لەجیاتی دیواری ئاگربڕی رەق و تەق، دیوارەکان سپی و بریقەدار بوون، بنمیچێکی بەرز و سپی بەسەرمەوە، - خۆ بەڕاستی من لەسەر تەختێکی نوێ و نامۆ راکشابووم، خۆ بە راستی خەون نەبوو، چرپە چرپی مرۆڤانم دەهاتە گوێ. دەبێت لەخۆشیان بێ دەستی خۆم بەو بارە چاوەڕواننەکراوە، بە توندی هەڵچووبم، چونکە گوێم لە نزیکبوونەوەی هەنگاوی پێیەك کرد لە پشتی سەرمەوە، ژنێك بە هەنگاوی نەرم نزیك کەوتەوە، ژنێك سەرپۆشێکی سپی بەسەرەوە بوو، خزمەتکارێك، پەرستارێك. راجفرانێکی خێرا کەوتە سەر جەستەم: ساڵێك دەبوو من هیچ ژنێکم نەدیبوو. بەچاوی ئەبلەق تەماشای ئەو دیاردە لەناکاوەم دەکرد، دەبێت ئەوە تەماشاییێکی کێویانەی ئەفسووناوی بووبێت:"ئارام بەرەوە، ئارام بەرەوە" نزیکبووەکە نەوازشی دەکردم. بەڵام من تەنها گوێم لە دەنگی گرتبوو :" ئەرێ ئەوە مرۆڤ نەبوو قسەی کرد؟ ئەرێ بەڕاستی مرۆڤێك هەبوو لەسەر زەوی، کە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ نەکات و ئازارم نەدات؟" سەرەڕای ئەمەش، پەڕجووێکی باوەڕپێنەکراو: دەنگێکی نەرم، گەرم، نزیکە ناسك، دەنگی ژن. بە مەراقەوە تەماشای دەمیم دەکرد، چونکە لەو ساڵە دۆزەخاوییە قسەی خۆش لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر لای من ببو بەشتێکی چاوەڕواننەکراو. بۆم پێکەنی - بەڵێ، بۆم پێکەنی، دیارە هێشتان مرۆڤێك هەیە بتوانێت ڕووخۆش بێت و پێبکەنێت-، پاشان بەمانای هەڕەشە پەنجەی ئاماژەی خستە سەرلێوەکانی و بە هێواشی ڕۆیشت. بەڵام من نەمتوانی گوێڕایەڵی فەرمانەکەی ببم. من هێشتان لە پەڕجووەکە واگا نەهاتبووم. بە زۆر ویستم لەجێگاکەم خۆم راستبکەمەوە، تا لە دواوە تەماشای بکەم، تەماشای ئەو پەڕجووە، تەماشای بووەنەوەرێکی مرۆڤیی بکەم، مرۆڤێکی ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین. بەڵام کە ویستم دەست لەسەرلێواری تەختەکەم دابنێم و راستببمەوە، نەمتوانی. ئەدی

کوا دەستی ڕاستم لە کوێیە، پەنجەکانم، مەچەکم، هەستم بە شتهاییێکی نامۆکرد، پەڕۆییێکی گەورەی سپی ئەستوور، دەبێت بڕێکی زۆر پەڕۆی برینپێچی بووبێت. بێ ئەوەی حاڵی ببم، جارێ لەو شتە سپیە نامۆیەی سەردەستم وردبوومەوە، پاشان وردە وردە بۆم خورد دەبووەوەو تێدەگەیشتم من لە کوێم، دەستم کرد بە بیرکردنەوە، دەبێت چیم بەسەر هاتبێت. دەبێت یەکێك برینداری کردبم، یان خۆم دەستی خۆم زامدار کردووە. من خۆم لە خەستەخانە دەدیت.

نیوەڕۆ پزیشکەکە هاتە لام، پیاوێکی کەمێك پیری ڕووخۆش. ناوی بنەماڵەکەمی دەناسی، زۆر بە ڕێزەوە باسی مامی دەکرد، ئەوەی کە پزیشکی تایبەتی قەیسەر بوو، یەکسەر هەستی ئەوەم لا دروست بوو، کە نیازی چاکەی لەگەڵمدا هەیە. لە ناواخنی قسەکانی تاکە پرسیارێک[...] کردم، پرسیارێك کە بۆ من جێگەی سەرسوڕمان بوو، پرسیاری ئەوەی لێ کردم، کە ئایا من کابراییێکی ماتماتیکزان یان کیمیازانم. منیش بە نەخێر وەڵامم دایەوە.

"عەجیب" لەبەر خۆیەوە منانەدی. "تۆ زۆر بە سەرگەرمییەوە هەمیشە فۆرموڵەی تایبەتیت دەنووسی–C3,C4. ئێمە هەموو نەماندەزانی ئەو فۆرمولانە چین".

من بۆم روونکردەوە، کە من چیم بەسەر هاتووە. بە سەرسوڕمانەوە پێکەنی.

"شتێکی وا مەترسیدار نیە. دەمارەکانی مێشکت تووشی سووربوونەوەیەکی توند بوون" دوای ئەوەی بەوردی تەماشای



دەوروبەری کرد، بە هێواشی بە بنگوێمدا چرپاندی:"ئەوەش شتێکی ئاشکرایە، دوای سێزدەی مارت وات بەسەرهاتووە، وانیە؟"

منیش سەری بەڵێم بۆ ڕاوەشاند. بە چرپە پێی وتم:"ئەوە شتێکی سەیر نیە، کە بەو ڕێوشوێنەی ئەوان وات لێ هاتووە، تۆش یەکەم کەس نیت، بەڵام خەمت نەبێت، شتێکی وا نیە."

بە هۆی شێوازی چرپە دڵنەوازەکەی و، نیگای پڕ لە میهرەبانی، زانیم کەوتوومەتە دەست کەسێکی ئەمین.

دوو ڕۆژ دواتر ئەو پزیشکە چاکە نزیکە بە ئازاییەکی ئازاد بۆی روون کردمەوە، کە چی ڕووی دا بوو. پاسەوانەکەم گوێی لە هاواری هاواری من دەبێت لە ژوورەکەم، وا دەزانێت یەکێك خۆی بە ژوورەکەم داکردووەو من شەڕمە لەگەڵی، هەر دەگاتە ژوورەکەی من، هوروژمی دەبەمە سەرو[...]یا هاواردەکەم: " دەی بجولێ دەی! هەی ترسەنۆك، هەی بێ ناموس، بەردەکەت بجوولێنە!" هەولی ئەوە دەدەم دەست بخەمە بینەقاقای کابرا، من وا بە دڕندەیی هێرشی بۆ دەبەم، کابرا ناچار دەبێت هاوار بکات بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن. پۆلیس دەگاتە سەرمان و دەمگرن. کاتێك بەو هاریە بە ڕاڕەوەکانم دادەبەن، بۆ ئەوەی بمگەیەننە نەخۆشخانە، من خۆم لە دەستی پۆلیس ڕادەپچڕێنم و خۆم بە جامی پەنجەرەی ڕاڕەوەکە دادەم وشوشەکە هەلا بە هەلا دەکەم و دەستم بە جامی شکاوی پەنجەرەکە شەق دەبێت. ئەوەتە تەماشا هێشتان قولایی جێ برینەکەم دەبینن. چەند شەوی یەکەم لە خەستەخانە بێ هۆش دەکەوم، دکتۆرەکە پێی وتم، بەڵام ئیتر

ئێستا تەواو چاکبوومەتەوەو ئاساییم. وە ووتی :"بەڵام من ئەوە بە لێپرسراوەکانت ناڵێم، دەنا دیسان دەتبەنەوە هەمان جێگەی پێشووت، تۆ هەقت نەبێت، بۆ منی لێ گەڕێ، ئەوەی پێم چاکە بۆتی دەکەم."

جا نازانم دوکتۆرەکەم چی لە بارەی باری نالەباری من گێڕاوەتەوەو چی پێ وتوون. هەرچۆنی بێت، ئەو گەیشتە ئەو مەبەستەی کە دەیەویست بیگاتی:ئازادی من. لەوانەیە بە شێتی لەقەڵەم دابم، یاخود لەوانەیە، لەو ماوەیە، ئیتر چیتر من بۆ گیستاپۆ بایەخم نەمابێت، چونکە تا ئەو حەڵە هیتلەر (بوێمن)[1] یشی داگیرکردبوو، ئیتر کارەکەی لە نەمسا مەیسەربوو. ئیتر من هەر ئەوەم خرا سەر، ئیمزای ئەوە بکەم کە لە ماوەی دوو هەفتە نیشتمانەکەمان جێبهێڵم. ئەو دوو هەفتەیەشم بە هەزاران کاری رۆتین داگیرکرا، ئەو کارە بیرۆکراتیانەی کە لەوان رۆژان بۆ هەر کەسێك کە وڵاتی جـ[...]ـتبا شتێکی پێویست بوو– کاغەزەکانی سەربازی، پوبیس، باج، پاسەپۆرت، ڤیزا، باوەڕنامەی تەندروستی– بەشێوەیك کاتی ئەوەم نەبوو بیر لە رووداوەکانی پێشوو بکەمەوە. دەبێت هێزێکی بەرنامەداری رێکوپێك لە مێشکی مرۆڤدا هەبێت، هێزێکی وا کە بەهۆیەوە هەر شتێکی ئازار و مەترسی بۆ گیان هەیە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیك خامۆش دەبێت. چونکە هەمیشە کە دەمەویست بەرەو دواوە بیربکەمەوە، بیر لە کونجی بەندیخانەکە بکەمەوە، وەك بڵێی

[1] ناوچەیەکی وڵاتی چیکە –و



رۆناکی لە مێشکمدا دەکوژایەوە" ئیتر پاشان، هەفتە دوای هەفتە، لەراستیدا، ئەوەتە تازە بە تازە، لێرە لەسەر پشتی ئەو کەشتیە، دووبارە هێزی ئەوەم هاتۆتەوە بەر، بتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە چی بەسەر من هێنرابوو.

ئێستا جەنابتان حالی بوون، کە بۆچی من ئاوا ناگوێڕایەڵانە، یان بە شێوەیەکی عەنتیکە بەرامبەر هاوڕێکانت ڕەفتارم نواند. من پیاسەم دەکرد لە هۆڵی جگەرەکێشان، بەرێکەوت چاوم بە هاوڕێکانت کەوت لەسەر تەختەی شەترەنج دانیشتبوون، یاری شەترەنجیان دەکرد. بە بینینی ئەمەو، لە سام و سەرسوڕماندا هەستم بە گۆدبوونی قاچەکانم کرد. چونکە من تەواو ئەوەم لەبیرچووبووەوە، کە دەتوانرێ یاری شەترەنج لەسەر تەختە شەترەنجێکی راستەقینەو، بەبەردەشەترەنجی راستەقینە یاری بکرێت. ئەوەم لەبیرچووبووەوە کە مرۆڤی تەواو لەیەکتر جیا دەتوانن جەستە بەرامبەر [...] دابنیشن و یاری دژی یەکتر بکەن. بەڕاستی چەند خولەحیحم ویست، تا ئەوە بێنمەوە بیر خۆم، کە ئەو یاری کەرانە لەوێ چی دەکەن، لە راستیدا هەمان ئەو یارییەیان دەکرد، کە من لە بێ چارەیی چەندان مانگ دژی خۆم دەمکرد. ئەوشفرانەی کەمن لە کاتە پەستەکانی خۆمدا یارمەتیم لێ وەردەگرتن، ئەوە خۆ هێماو جێگری ئەو بەردەشەترەنجانە بوو" ئەوەی تووشی سەرسووڕمانی کردبووم ئەوە بوو، ئەو بەردانەی سەر تەختە شەترەنجەکە هەمان ئەو ئەندێشەو و فەنتازیانەی کەشی خەیاڵی من بوون، وەك ئەوەی ئەستێرە ناسێك کە بە رێگاییێکی ئاڵۆز، لەسەر کاغەز بە لێکدانەوەو حسێبێکی

ورد ئەستێرەیەك بدۆزێتەوە، پاشانیش لە ئاسماندا بەڕاستی ئەستێرەکەی وەك تەنێکی تەندار ساف و سپی بکەوێتە بەرچاو. وەك موگناتیس رامبکێشێ، ئاوا نیگام بە تەختە شەترەنجەکە شەتەك ببوو، لەوێ شێوازی هێلکاریەکەی خۆم دەدیت، ئەسپ، قەڵا، مەلیك، شاژن، سەرباز، وەکو پارچە تەنی ڕاستی، وەك داری داتاشراو" تا لە وەستگای هەر دوو لایەنی یاریکەر بگەم، بێدەستی خۆم جارێ ناچار بووم بچمەوە ناو جیهانی ئەندێشەی هیماکانم، تا لە بەردەجوڵاوەکان بگەم. وردە وردە مەراق بەسەرمدا زاڵ بوو، ناچاری کردم چاودێری ئەویارییە راستەقینەیە بکەم. ئیتر لێرەوە شتە ناهەموارەکە ڕوویدا، من هەموو شەرمێکم لە یاد چوو، خۆم بە زۆر لە یارییەکەیان هەڵقورتاند. بەڵام ئەو بەردجوڵانە هەڵەیەی هاوڕێکانت وەك نەقیزە بوو لە دڵم درا، ئەوە شتێکی تەواو غەریزی بوو، کە من لە جووڵەکە پاشگەزم کردنەوە، ئەوە وەك ئەوەوابوو، بێ دەستی خۆت وبێ بیرکردنەوە پڕ بدەیتە منداڵێك و بیگریت کە ببینیت خەریك بێت خۆی لە تەلانێك شۆڕبکاتەوە. زۆر درەنگ ئەوەم بۆ ڕۆشن بووەوە، کە ئەوە پەیوەندی بەمن نەبوو، بەو خۆهەڵتێقورتانە زۆرەکییەکە خۆم شەرمەزارکرد."

من بە پەلە هەولی ئەوەم دا کە (دکتۆر بی) لەوە دڵنیا بکەم، کە ئێمە چۆن هەموو زۆر خۆشحاڵ بووین، کە بەو ڕێکەوتە ئەومان ناسیوە، وە دوای ئەوەی ئەو، ئەو هەموو باوەڕەی بە من بەخشی، دوو ئەوەندەی پێشتر، پتر حەزدەکەین و لامان گرنگە، ئەگەر بۆمان هەبێت و ئیجازە بفەرموون لە یاری بەیانی بە دیداری شادببین. (دکتۆر بی) جووڵەیەکی نائارامی پێشاندا.

"نەخێر، ئەوەندە زۆر لەمن چاوەڕێ مەکەن. ئەوە بۆ من لە تاقیکردنەوەیەك پتر نابێت... تاقیکردنەوەیەك، کە ئایا من... ئایا من بەڕاستی بەهرەی ئەوەم هەیە، یارییێکی ئاسایی شەترەنج یاری بکەم، یارییێك لەسەر تەختەشەترەنجی ڕاستی و بە بەردەشەترەنجی ڕاستی و بەرامبەر دژێکی زیندوو... چونکە ئێستاش من گومان لەوە دەکەم، کە ئایا ئەو سەدان و هەزاران یارییەی من کردوومن، ئایا بە پێی ڕێساو یاسای شەترەنج بوونەو، هوڕێنەیاری، هوڕێنەشەترەنج یان خەونەشەترەنج نەبوونە، کە تێیاندا بەسەر هەنگاوەکان بازم دابێت. هیوادارم وا بە جیددیتان نەبێت، کە من بۆ ئەوە دەگونجێم، بەرامبەر پاڵەوانێکی، تەنانەت پاڵەوانی یەکەمی جیهانی بوەستم. ئەوەی لای من گرنگەو پاڵم پێوە دەنێت، کە ئەویش مەراقێکی ڕووتە، دەمەوێ ئەوە ساغ بکەمەوە، کە ئایا من لە ژووری زیندان، ئەو دەم، یاری شەترەنجم کردووە، یان شێتاتییێك بووە، دەمەوێ بزانم ئەو دەم لە لێواری یان بگرە لەناو ئەو دیوی بارە خەتەرناکەکە بوویمە، تەنها ئەوە، ئەوەو بەس."

لەو چاوتروکانەدا بوو، کە زەنگی ژەمی ئێوارە لە بڵندگۆی کەشتییەکە هاتە گوێ. دەبێت دوو سەعاتێك لەگەڵ یەکتردا لە گفتوگۆدا بووبین، (دکتۆر بی) بەسەر هاتەکەی خۆی زۆر بە وردی بۆ گێڕامەوە، زۆر وردتر لەوەی من بۆم باس کردن. لە قوڵاییی دڵەوە زۆر سوپاسم کرد و ماڵئاواییم لێ کرد، بەڵام هێشتان

بانەکەم جێ نەهێشتبوو، بە هەڵچوونەوە بۆ لام هات و لابەلا ئەم چەند قسەیەشی بۆ کردم:

"شتێکی تریش! پێویستە لە پێشەوە بەو جەنابە بڵێن، نەبادا دواتر شەرمەزار بم: من تەنها یەك تاکە یاری لەگەڵدا دەکەم و پتر نا... وە ئەو یارییەش پەیوەندی بە یارییەکەی پێشوو نیە، تاکە یارییێکەو دەستپێکێکی نوێ نیە... من نامەوێت بۆ جاری دووەم تووشی ئەو تایە ئازاردەری یاری ببم، ئەوەی تەنها ئازارم بیردەهێنێتەوە... بشزانە... بشزانە ئەودەم پزیشك ئاگاداری کردمەوە... بە ڕۆشنی ئاگاداری کردمەوە، ئەوەی خوو بەشتێك بگرێت، هەمیشە لە مەترسی ئەوەدا دەبێت، وە کەسێکی -لە نەخۆشی ژەهراوبوونی شەترەنجی- چاکیش بووبێتەوە، باشترە بە هیچ جۆرێك لە تەختەی شەترەنج نزیك نەبێتەوە... ئەوجا جەنابتان تێدەگەن- تەنها ئەوە تاکە یارییێکە، وەك خۆجەڕباندنێك بۆ خۆم و هیچی تر."

تەواو لە کاتی دیاریکراودا ... تژمێر سێ، هەموومان لە هۆڵی جگارەکێشاندا کۆبووینەوە. دوو حەسی تریش کە ئاشقەی یاری پاتشایان بوون، لە ناوماندا زیادی کردبوو، کە دوو ئەفسەری کەشتییەکە بوون و تکای مۆڵەتیان لە بەڕێوەبەرایەتی کەشتییەکە کردبوو، تا بتوانن ئەو یارییە تەماشا بکەن. چێنتۆڤیچیش نەیهێشت وەك ڕۆژانی پێشوو چاوەڕوانی بکرێت، دوای هەڵبژاردنی ڕەنگەکان بە پێی ڕێسا، ئەو مرۆڤە مێشك ئالۆزە دەستی کرد بە یاری دژی پاڵەوانی بەناوبانگی جیهانی. ئەوە جێگەی داخە بۆمن، کە ئەوان تەنها بۆئێمەی تەماشاکەرانی



بەڕاستی نەشارەزا یارییان دەکردو، هەنگاونامەی یارییەکە لەهەواڵنامەی مێژوویی وانەی شەترەنج یادداشت نەکراو گوم بوو، هەروەك بەرهەمە سەرپێیەکانی پیانۆکەی بیتهۆڤن لە موزیك. لە ڕاستیدا دوا نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم پێکەوە هەولی ئەوەمان دا شونگری ڕێڕەوی یارییەکە بکەینەوە" بەڵام بێ ئەنجام" لەوانەیە لە کاتی یارییەکە، لەجیاتی ئەوەی سەرنج بدەینە سەر هەنگاوەکانی یاری، هەموو سەرنجی خۆمان دابێتە سەر هەردوو لایەنی یاریکەر. چونکە چەند یارییەکە درێژەی دەکێشا، ئەوەندە پتر نەخشە دژ بەیەکەکانیان، لە دەم وچاو و پەیکەریان بە بەرجەستەیی دەردەکەوت. چێنتۆڤیچ وەك عادەتی خۆی لەسەرەتای یارییەکە تاکۆتایی وەك بلۆك بێ جووڵە یاری دەکرد، چاوەکانی بە خەستی و بە ئەبڵەقی بەرەو تەختە شەترەنجەکە شۆڕببوەوە" لەجەستەیدا خەستەیی تێڕامان دەردەکەوت، هەموو ئەندامەکانی جەستەی لە یارییەکەدا چڕببوونەوە. هەرچی (دکت... ...بی) بوو، تەواو بێ باك و لەسەرەخۆیانە بەردەکانی حوی دەجوڵاند. دیار بوو هەر بەهەوەس، پڕ بەمانای وشە، وەك ئەوەی یاری لە یارییەکەدا بکات و خۆشی لێ وەربگرێت، بە جەستەیەکی تەواو خاو یاری دەکرد و لە پشووەکانی سەرەتا قسەی لەگەڵ ئێمەدا دەکردو یارییەکەی بۆ باس دەکردین، کە نۆبەی دەهات بە ئارامی جگەرەیەکی دادەگیرساندو هەرجارێك خولەکێك لەسەر تەختەشەترەنجەکە دەمایەوە، وا دەردەکەوت کە هەموو جارێك جووڵەی بەرامبەرکەی دەمێك بێت پێشبینی کردبێت.

جووڵە ڕێساییەکانی سەرەتایی وەك بڵێی زوو بەڕێوەچوون. دوای حەفتەمین یان هەشتەمین جووڵە، جۆرێك لە نەخشەدانانێکی دیار هاتبووە ئارا. پشووی بیرکردنەوەکانی چێنتۆڤیچ درێژ بوونەوە“ ئێمە هەستمان بەوە دەکرد، کە ململانێی پێشرەوتی دەستی پێکردبوو. بەڵام بۆ ئەوەی ڕێزی ڕاستی بگرین، گەرەکە ئەوە بڵێم، وردە وردە بەرەو پێشەوچوونی یارییەکە بۆئێمەی ناپسپۆر، جۆرە هیوابڕاوییێکی تێدا بوو. چونکە هەرچەندە بەردەشەترەنجەکان پتر بە نەخش و نیگاری تایبەت دەچڕژانە ناویەکتر، ئەوەندە پتر ئاستی یارییەکە بۆ ئێمە نادیارتر دەبوو. ئێمە لە مەبەستی نە ئەم و نە ئەوەی تریان دەگەیشتین و نەشماندەزانی کامەیان باڵادەستە. تەنها ئەوەمان دەدیت، کە تاکە تاکەی بەردەکان دەجولێنرێنەوە بۆ ئەوەی هەریەکە بگاتە هێڵی پێشەوەی بەرەی بەرامبەر، بەڵام ئێمە لێیان حالیٚ نەدەبووین، چونکە هەر جوڵاندنێکی ئەو یارییە بیرکارییە، بەسترابووەوە بە چەندەها [illegible]ی پێشبینیکراو، بۆئەوەی لە



ستراتیجی یەکتر بگەن و ڕەیان بکەنەوە. تا وای لیٚ هات وردە وەردە تووشی ماندبوونێکی جاڕساوی بووین، بەتایبەت بەهۆی بیرکردنەوە درێژ و بیٚ کۆتاییەکانی چێنتۆڤیچ. من بە شپرزەییەوە سەرنجی ئەوەم دەدا، کە چۆن (دکتۆر بی)، هەر چەند جووڵاندنی بەردەکانی چێنتۆڤیچ پتر دوا دەکەویٚ، ئەو نائارامتر لەسەر کورسیەکەی دەست بە خۆراکێشانەوە دەکات و، بەبیٚ سەبری زوو زوو جگەرە دوای جگەرە دادەگیرسێنیٚ، زوو زووش دەست بۆ قەڵەمەکەی دەبات بۆ ئەوەی تێبینیەییەك یادداشت بکات. پاشان

دیسان داوای شووشەیەك ئاوی مادەنی دەکات و، بە خێرایی گلاس دوای گلاس هەڵیدەچۆڕیٚ“ وا دەردەکەوت کە سەت کەڕەت خێراتر لە چێنتۆڤیچ داهاتووی یارییەکە لێکبداتەوە. هەموو جارێك کە دوای تێفکرینێکی بیٚ کۆتایی، چێنتۆڤیچ بڕیاری خۆی دەداو داشێکی بەرەو پێش دەجولاند، دۆستەکەی ئێمە زەردەخەنەیەکی دەهاتیٚ و، یەکسەر داشی خۆی دەجولاند، وەك ئەوەی یەکێك دەمێکی زۆرچاوەڕوانی شتێك بکات وپاشان وەك چاوەڕوانکراوە شتەکە وا بێتە دی. دەبێت ئەو بە هۆی مێشکە زۆر خێراکەی سەری، هەموو ئەگەرەکانی بەرامبەرەکەی زوو پێشبینی کردبێت و لێکی دابنەوە“ هەرچەندە بیرکردنەوەکەی چێنتۆڤیچ درێژدادرتڕ دەبوو، (دکتۆربی) سەبری کەمتر دەبوو، لەو کاتەی چاوەڕوانی دەکرد، لێوی خۆی دەکرۆشت و، لۆچێکی تووڕەیی و بگرە دوژمنکارانە دەکەوتە سەر هەنیەی، بەڵام چێنتۆڤیچ تەقەی سەری دەهات و بە هیچ شێوەیەك باری خۆی تێکنەدەدا. هەرچەندە خانە[illegible]ەترەنجەکە چۆڵتر دەبوون، ئەو



پتر بیٚ دەنگ و چیڕتر بیری دەحردەوەو بەردەوام پشووەکانی خۆی درێژتردەکردەوە. دوای چل و دوو جووڵەو، دوای چل پەنجاخولەکێك، ئێمە هەموو بە خەستەیی و نزیکە بە دابڕاوی لە گەمەکە، لە دەوری مێزی یاری شەکەت ببووین. یەکێك لە دوو ئەفسەرەکە یارییەکەی جێهێشتیبوو، ئەوەی تریشیان کتێبێکی بۆ خوێندنەوە لە دەست گرتبوو، تەنها ناوە ناوە لە کاتی گۆڕانێك سووکە تەماشاییێکی تەختەشەترەنجەکەی دەکرد. بەڵام لە ناکاوێك لەگەڵ جووڵەی داشێکی چێنتۆڤیچ شتە

چاوەڕواننەکراوەکە ڕوویدا. هەرکە چێنتۆڤیچ دەستی خستە سەر ئەسپەکەی، تا بەرەو پێشەوەی ببات، چۆن پشیلەیەك بۆ بازدان خۆی گرژدەکات، ئاوا (دکتۆربی) هەموو جەستەی کەوتە لەرزین، هێشتان چێنتۆڤیچ ئەسپەکەی بە تەواوی لە شوێنی خۆی دانەنابوو، ئەو مەلیکەکەی خۆی بە گورجی پاڵپێوەناو، بە دەنگێکی بەرز و بەخۆشحاڵی هاواری کرد: "ئەوها! ئیتر فەوتا!" پشتی خۆی خستەوە سەرکورسییەکەی و بەرەو دوا کشاوە، جەستەکانی خستە سەرسنگی و، بەچاوێکی وەرەبەرێیانە تەماشای چێنتۆڤیچی دەکرد. لە ناکاو تروسکێکی گەرم کەوتە سەر بیلبیلەکانی.

بێ ویستی خۆمان، خۆمان چەماندەوە سەر تەختەکە، بۆ ئەوەی لەم جوولەو بەزم ڕاگەیاندنە بگەین. لە تەماشای یەکەم هیچ مەترسییەك دیار نەبوو. کەواتە ئەو هەرایەی دۆستەکەمان پەیوەندی بە برەوی دوایی یارییەکە هەیە، ئەوەی ئێمەی کورتەبیر و نەشارەزا، نەم[illegible]وانی لێکی بدەینەوە. تەنها



چێنتۆڤیچ بوو لە ناومان، حە خۆی لەو وەرەبەرێیەی دۆستەکەمان نەبان گرتبوو" وا مەحکەم دانیشتبوو، وەك ئەوەی "ئیتر فەوتا" تەوهیناویەکەی هەر نەشبیستبێ وا بوو. هیچ ڕووی نەدا. سەبارەت بەوەی بێ دەستی خۆمان، ئێمە هەموو هەناسەمان ڕاگرتبوو، لە کاوڕا دەنگی چکە چکی ئەو سەعاتە دەهاتە گوێ، کە بۆ دیاریکردنی کاتی جوولان لەسەر مێزەکە دانراوو. سێ خولەکی پێ چوو، بوو بە حەوت، هەشت، چنتۆڤیچ جووڵەی نەکرد، بەڵام من وام دەهاتە بەرچاو کە بەهۆی هەوڵ و

خەستەیی ناوەوەی ، کونە لووتەکانی فراوانتر دەکرانەوە. دۆستەکەمان دیار بوو وەك ئێمە بەرگەی ئەو چاوەڕوانییە بەردینەی نەدەگرت، لە ناکاو هەستایەوە سەرپێیان و دەرپەڕی، لە هۆڵی جگەرەکێشان دەستی بە هات و چۆ کرد. لە سەرەتا بە هێواشی، پاشان خێراتر و خێراتر. هەموو بە سەرسوڕماوی تەماشامان دەکرد، بەڵام کەسیان وەك من نائارام نەببوون، چونکە لەگەڵ ئەو خێراییە، هاتوچۆکەی لەنێوانی دوو پنتی نادیار بوو" وەك ئەوەی لە ژوورێکی چۆڵ هەمیشە ڕووبەڕووی دوو دیواری نادیار ببێتەوەو ناچار بێت بگەڕێتەوە. لە تەماشاکردندا زانیم کە لەو هاتوچۆیەیدا، ئەو بێ ویستی خۆی، خۆی لە پێوانەی ژووری بەندیخانەکەی جارانی دەبینێتەوە" دەبێ تەواو ئاوا، لە ژووری بەندیخانەکەی، ئەو هەموو مانگە، وەك گیانەوەرێکی ناو قەفەز، لە هاتوچۆدا بووبێت، تەواو ئاوا دەستەکانی هەڵکرما بووبن و شانەکانی وا شۆڕبووبنەوە" دەبێ تەنها هەر ئاوا بووبێت و هەزاران جار هاتوچۆی کردبێ[illegible]بێ ئاوا تووشی چرای سووری



شێتێتی ونیگای تادار بووبیت. بەڵام دیار بوو کە هێشتان سامانی بیرکردنەوەی بە تەواوی لە چالاکیدا بوو، چونکە ناوە ناوە ئاوڕێکی بۆسەر مێزی شەترەنجەکە دەدایەوە، تا بزانێت کە ئایا چنتۆڤیچ بڕیاری خۆی داوە، بەڵام کات بوو بە نۆ خولەك، دە خولەك. ئەوجا ئەوە ڕوویدا، ئەوەی کەس لە ئێمە چاوەڕوانی نەدەکرد. چێنتۆڤیچ بە هێواشی دەستەگرانەکەی خۆی بەرزکردەوە، کە تا ئەو کاتە بێ جووڵە خستبوویە سەر مێزەکە. هەموو بە مەراقەوە چاوەڕوانی بڕیارەکەی ئەومان دەکرد. بەڵام

چێنتۆڤیچ هیچ داشێکی نەجولاند، بەڵکوو بە پشتی دەستی خۆی پالی بە هەموو داشەبەردەکانی سەر تەختەکە وەناو ڕای ماڵین و تێکی وەردان. ئەوجا ئێمە تێگەییشتین: چێنتۆڤیچ بەزینی خۆی ڕاگەیاند. ئەو خۆی دایە دەستەوە، تا لەبەرچاوی ئێمە بە ئاشکرا مات مەلیکی لێ نەکرێت. ئەوەی کە نەدەبوو ڕوو بدا، ڕوویدا، لە لایەن کەسێکی نەناسراوەوە، لەلایەن کەسێکەوە کە بیست یان بیستوپێنج ساڵە دەستی بە تەختەی شەترەنج نەکەوتووە، ئالای پالەوانی جیهانی، لە کە سێك سەندرایەوە، کە لە چەندەها یاری براوە بووە. دۆستەکەمان، دۆستە بێ ناوەکەمان، کەسێکی فەرامۆشکراو، بەهێزترین یاریکاری شەترەنجی سەر ئەو زەمینەی لە ململانییێکی کراوەدا بەزاند!

لە خۆشییان بێ ئەوەی ئاگامان لە خۆ بێت، یەك لە دوای یەك هەموو هەستاینەوە سەرپییان. هەر یەکێك لە ئێمە هەستی بەوە دەکرد، کە پێویستە شتێك بڵێت، تا ئەو حەپەساوی خۆشیە لەخۆمان بڕەوێنینەوە. ئەوە  بێ جووڵەو وەك خۆی ئارام مایەوە چێنتۆڤیچ بوو، دوای پشوویێکیتەواو سەری خۆی بەرزکردەوەو بە چاوەکانی تەماشای دۆستەکەی ئێمەی کرد پرسی:

"گەمەیەکی تریش؟"(دکتۆربی)ش بە حەماسەتێکی نائاسوودە وەلامی دایەوە: " بێ گومان!"، ئەمەی ووت و یەکسەر چووە سەرکورسییەکەی ودانیشت، پێش ئەوەی من دەرفەتی ئەوەم هەبێت ئاگاداری بکەمەوە، کە خۆی لە یارییێکی تر بپارێزێت، بە خێراییێکی پەشۆکاو دەستی کرد بەوەی داشەکان سەرلەنوێ ڕێز بکاتەوە. وا بە تەنگەتاوی داشەکانی دادەنایە سەر تەختەکە، بە جۆرێك بە دەستە لەرزاوەکەی دووجاران سەربازێك لەمێزەکە کەوتە خوارەوە" دوودڵییەکەی من بەهۆی هەڵچوونە ناسروشتییەکەی ئەو گۆڕابوو بۆجۆرە ترسێك. چونکە هەڵچوونێکی دیار نیشتبووە سەر جەستەی ئەومرۆڤە، کە تائێستا بێ دەنگ وئارام بوو" لەرەلێوەکەی وردە وردە زیادی دەکرد، جەستەشی وەك بینای ئاو دەلەرزی وەك ئەوەی کەوتبێتە ژێر کاریگەری شەترەنجەتایەکەی خۆی.

سەرم بردە بن گوێی و بە چرپە پێم گوت:"نەکەی، ئێستا نەیکەی، با بۆ ئەمڕۆ بەس بێت، ئەوە بۆ تۆ کارێکی سەختە!"

"کارێکی سەختە! ها" بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و گالتەی بە قسەکەم هات:"دەمتوانی حەڤدە یاری بکەم، لەجیاتی ئەو تەمبەڵکارییە! ئەوەی من خەستە دەکات ئەو هێواشییە، کە ناش بێت خەوم لێ بکەوێت، دەی! جەناب دەی! دەست پێ بکەن!"

ئەو وشانەی دوایی بە دە  ی زۆر توندوتیژی نزیکە وەك جنێو دەربڕی. چێنتۆڤیچیش بە ئارامییێکی گونجاو تەماشای دەکرد، بەلام تەماشا بەردینەکەی مستکۆڵەیەکی توندی دەهێنا بەرچاو. بە جارێك شتهاییێکی نوێ کەوتە نێوان هەر دوو یاریکەر" گرژییێکی مەترسیدار، کینەیەکی ئازاردەر. ئیتر ئەوان دوو یاریکەری وا نەبوون، کە توانای خۆیان بە یەکتری تاقی بکەنەوە، بەڵکوو دوو دوژمن بوون بەرامبەر یەکترو سوێندی ئەوەیان دەخوارد کە یەکتر لەناو ببەن. زۆری برد تا چێنتۆڤیچ داشی یەکەمی جولاند، من بە ڕۆشنی هەستم بەوە کرد، کە بە ئانقەست

ئەو بەردەی خۆی وا درەنگ جولاند. دیارە ئەو تاکتیکبازە هەستی بەوە کردبوو، کە دەتوانێت بە هۆی هێواشیاری بەرامبەرەکەی خەستە بکات و سەری لێ بشێوێنێت. بۆیەشە پتر لەچوارخولەکی برد، تا ساکارترین جووڵەی بەردی یەکەمی کردنەوەی یارییەکەی بە ئەنجام گەیاند و سەربازەکەی بەردەم مەلیکی دوو خانە بردە پێشەوە. یەکسەرە دۆستەکەمان بە بردنە پێشی سەربازی بەردەم مەلیکەکەی ڕوو بە ڕووی بووەوە، بەڵام دیسان چێنتۆڤیچ دەستی کرد بە پشووێکی بێ کۆتایی وا، کە بەرگەگرتنی سەخت بوو“ دەتگوت بروسکەیەکە لێ دەدات و مرۆڤ چاوەڕوانی هاڕەی گەواڵەیەکی لێ دەکرد، بەڵام گەواڵەکە نەدەهات و نەدەهات. چێنتۆڤیچ خۆی تێك نەدەدا. بە ئارامی بیری دەکردەوە، بە هێواشی و، وەك ئەوەی منیش هەستم پێ دەکرد، هەندێك بە ساختەکاری“ بەمەش کاتی تەواوم هەبوو، سەرنج بدەمە (دکتۆر بی). ئەو تا ئەو کاتە سێ پەرداخ ئاوی ئاوا کردبوو“ بێ دەستی خۆم تێنوێتییە تادارییەکەیم دەهاتەوە بیر، ئەوەی کە بۆی گێڕابوومەوە، کە چۆن لە کونجی بەندیخانەکەی تووشی هاتبوو. هەموو دیاردەکانی هەڵچوونێکی نائاسایی بە ڕۆشنی بە سیماوە دیاربوو“ دەمدیت کە چۆن نێوچەوانی بە ئارەق شێدار دەبێت و برینی دەستی سوور هەڵدەگەڕێت، سوورتر لە پێشوو. بەڵام هێشتان دەیتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات. تا ئەو کاتەی کە چێنتۆڤیچ لە جوولەی چوارەمی کەوتەوە ناو پشووە بێ کۆتاییەکەی، ئیتر لە کۆنترۆڵەی خۆی دەرچوو، لە ناکاو بەسەر چێنتۆڤیچدا قیژاندی: "دەی ماڵت نەڕمێت، دە بەردەکەت بجوولێنە! شەقم برد!" چێنتۆڤیچیش بە ساردییێکەوە تەماشای کرد و وتی:"وەك من دەزانم، ئێمە ڕێکەوتووین کە کاتی بیریکردنەوە دە خوولەکە، من بە شێوەیەکی گشتی بە خێرایی یاری ناکەم."

(دکتۆر بی) لێوی خۆی کرۆژت“ من سەرنجی ئەوەم دا، کە چۆن بە نا ئارامی بەردەوام پاژنەکانی خۆی لە ژێر کورسییەکەی لە زەوی دەکوتی و، وردە وردە دەمارگیر و تەنگەتاو دەبوو، وەك ئەوەی شتێکی نەگونجاو لە ناوەوەی، دەهاتە پێشەوەو پاڵەپەستۆی دەخستە سەر. ئیتر ئەوە بوو لە هەشتەمین جووڵەدا ڕووداوی دووەمیش ڕوویدا. (دکتۆر بی) کە بێ دەسەڵاتی خۆی چاوەڕوانی دەکرد، چیتر نەیتوانی بەری ئەوگرژییەی دەروونی خۆی بگرێت و، لەسەر کورسیەکەی پاش و پێشی دەکرد و پاشان بێ دەستی خۆی بە پەنجەکانی کەوتە کوتینی مێزەکە. لە ناکاو چێنتۆڤیچ سەرە قورسە فەلاحییەکەی بەرزکردەوەو وتی:"دەتوانم تکا لە جەنابتان بکەم، کە واز لەو مێزکوتینە بهێنن؟ ئەو کوتە کوتە سەرم لێ تێکدەدات، ئاوا ناتوانم یاری بکەم". (دکتۆر بی) ووتی:"ئاوها! خۆ دیارە کە ناتوانن یاری بکەن" چێنتۆڤیچ نێوچەوانی سوور هەڵگەڕاو بە دەنگێکی قڵسی کینەدار پرسی:"مەبەست[illegible]یە لەم قسە" (دکتۆر بی) بە پێکەنین و نزیکە گاڵتەجاڕییەوە ووتی:"هیچ. دیارە کە ئێوە زۆر پەشۆکاون."

چێنتۆڤیچ بێ دەنگ بوو، سەری چەماندەوە. حەوت خولەکی پێ چوو، ئەوجا داشەکەی خۆی بزواند، بەو هێواشییە هەناوپسێنە

یارییەکە بەڕێوەدەچوو. چێنتۆڤیچ جار لە جار پتر چڕەی دەدایێ، تا وای لێ هات تەواوی ئەو دە خولەکەی لەسەری ڕێککەوتبوون، بە بیرکردنەوە پڕی دەکردەوە، ئەوجا بڕیاری داش جولانی خۆی دەدا، هەڵسوکەوتی دۆستەکەی ئێمەش پشوو دوا پشوو عەنتیکەتر دەبوو. وا دەهاتە بەرچاو، وەك ئەوەی ئیتر وازی لە یارییەکە هێنابێت و بەشتێکی تر خەریك بێت. ئیتر وازی لە چوونە پێش و پاشەکە هێنابوو، لە شوێنی خۆی بێ جوولە دانیشتبوو. بە نیگایێکی ئەبلەقاوی نزیکە شێتانە تەماشای بۆشایی دەکرد، بە بەردەوامی لەبەرەخۆی ورتە ورتێکی لێوەدەهات ، بەڵام کەس لە وشەکانی نەدەگەیشت" خۆی لە ئەگەرە بێ پایانەکان گوم کردبوو، یان ئەوەتە وەك من گومانم دەکرد خەریکی یارییێکی تربوو، چونکە ئەوجارە کە چێنتۆڤیچ دوای پشوویێکی بێ کۆتایی بەردەکەی خۆی بزواند، ناچاربووین لەو خەیاڵپەرتییەی واگای بهێنینیەوەو بیهێنینیەوە سەر یارییەکە. ئەوجا چەندخولەکێکی وییست تا دیسان بارودۆخی یارییەکەی هێناوە بیری خۆی" من گومانی ئەوەم بۆ دەهات، کە ئەو لەمێژبوو لە ناو ئەو شێوە ساردەی شێتاتییە، چێنتۆڤیچ و ئێمەی لەیاد چوو بوو، وە بەجۆرێك تەنگەتاوی توانی خۆی لەو شێتناتییە خالی بکات. وەبەڕاستیش لە نۆزدەمین جووڵەدا گرژییەکە بەرپا بوو، چێنتۆڤیچ پەنجەی خستە سەر بەردەکەی و هێشتان بەتەواوی نەیجولاندبوو، کە (دکتۆر بی) لە هیکڕا، بێ ئەوەی بە تەواوی تەماشای تەختەشەترەنجەکە بکات، فیلەکەی خۆی سێ خانە بردە پێش و وا قیژاندی کە ئێمە هەموو ڕاپەڕین:"کش! کش مەلیك!"

ئێمە چاوەڕوانی جووڵەیەکی تایبەتیمان لەبەردەکانی چێنتۆڤیچەوە دەکرد. بەڵام دوای خولەکێك ئەوەی ڕوویدا، کەس لە ئێمە چاوەڕوانی نەدەکرد، چێنتۆڤیچ کە تا ئێستا سەری خۆی لە شەترەنجەکەوە بەرزنەکردبووەوە، زۆر زۆر بە هێواشی سەری خۆی بەرزکردەوەو، تەماشای یەکە یەکەمانی کرد. وادەهاتە بەرچاو کە چێژێکی زۆر لە شتهایێك وەربگرێت، چونکە وردە وردە زەردەخەنەیەکی خۆشحاڵی و گاڵتەئامێزانە دەنیشتە سەر لێوەکانی. دوای ئەوەی تا دواچۆڕی چێژ، چێژی لەو خۆشحاڵییەی وەرگرت، کە هێشتان ئێمە لێی حالی نەببوین، ئەوجا تەماشیێکی بازنەکەی ئێمەی کردو بە ڕێزێکی ساختەوە ووتی:"بەداخەوە- بەڵام من هیچ کشێك نابینم، ئەرێ یەکێك لە ئاغایان کشێك دژی مەلیکەکەی من دەبینێت؟"

ئێمە بەنائارامی لەتەختەشەترەنجەکەو پاشانیش لە(دکتۆربی) وردبووینەوە. بەڕاستی بۆ منداڵێکیش ئاشکرا بوو، کە مەلیکەکەی چێنتۆڤیچ بە هۆی سەربازێك بە تەواوی لە فیلەکەی (دکتۆربی) پارێزراو بوو، کەواتە هیچ کش مەلیکێك لە ئارادا نەبوو. ئێمە بەتەواو نارامی بەسەرماندا زاڵ بوو. ئەگەر دۆستەکەمان لە ژێر کاریگەری تایەکەی بەردێکی تری بزواندبێت، یان خانەیەك کەمتر یان پتری چووبێتە پێش؟ بەهۆی بێدەنگی ئێمە (دکتۆر بی)ش تەماشای تەختەشەترەنجەکەی کرد و بە لاروپتی کەوتە قسە:

"بەڵام مەلیك لەسەر خانەی f7 بوو... ئێستا شوێنەکەی هەڵەیە بە تەواوی هەڵەیە. تۆ بە هەڵە جولاندووتە! شوێنی هەموو بەردەکان هەڵەیە...ئەو سەربازە لەسەرg5 بوو، لەسەرg4 نەبوو... ئەوە تەواو یارییێکی ترە... ئەوە..."

لە ناکاو نوتقی گیرا. من بە توندی دەستی خۆم لە بن شانەکانی گیرکردو، بە توندی قۆڵەکانیم گوشی، بە شێوەیەك کە لەو بارە تاداری و شێتاتییەش هەست بە ڕاگووشینی قۆڵەکانی خۆی بکات. ئاوڕی لە من دایەوەو لەمن ڕاما، وەك ئەوەی لە خەوندا بێت، ووتی:"ئەوە چییە... دەتانەوێت چی بکەن؟"

من هەر ئەوەندەم پێ گوت:"بێنەوە بیری خۆت!" و بە پەنجە ئاماژەم بۆ برینی سەر دەستی کرد. ئەویش بێ دەستی خۆی، چاوی بە دوای ئاماژەکەی من جولاندو، بە نیگاییێکی ئەبڵەقی شووشەیی، تەماشای هێڵی برینە سوورهەڵگەڕاوەکەی سەر دەستی کرد. پاشان لە ناکاو دەستی بە لەرزین کرد و کەفێك بە هەموو جەستەی هاتە خوارە



"بکەن لە ڕاهی خوای" چرپەیەکی کرد و، بە لێویێکی زەردهەڵگەڕاو، ووتی:"خۆ شتێکی خراپم لە دەم دەرنەچووە، یان کارێکی کرێتم نەکردووە،... دیسان تووشم هاتەوە...؟"

"نەخێر" بە چرپە پێم ووت. "بەڵام پێویستە هەرئێستا واز لەم یارییە بهێنیت، ئەوە بارە خەتەرناکەکەیە، بێنەوە بیری خۆت، پزیشك چی بە جەنابتان گوتووە!"

(دکتۆر بی) بە یەك تەوژم هەستایەوە سەر پییان و بە دەنگە شەرمنەکەی پێشووی خۆی ووتی: "داوای لێبورنتان لێ دەکەم، لەو هەڵە گەلۆرییەی کردم"، خۆی بۆ چێنتۆڤیچ چەماندەوەو ووتی: "بێ گومان ئەوەی ووتم شتێکی بێ مانا بوو، بێ گومان ئێوە براوەن" پاشان ڕووی لە ئێمەش کرد:"داوای لێبوردن لە ئێوەی بەڕێزیش دەکەم، بەڵام من لەمەو پێش ئاگادارم کردنەوەو پێم گوتن، چاوەڕوانی زۆر لە من مەکەن، بمبوورن لەو ناهەموارییە – ئەوە دوا جار بوو، من دەستم بۆ شەترەنج برد."

بەڕێزەوە خۆی چەماندەوەو بە هەمان ئەو شێوە خاکی وپڕنهێنییەی کە پێشتر دیبوومان ئێمەی جێهێشت. تەنها من دەمزانی لەبەرچی جارێکی تر ئەو پیاوە دەست بۆ تەختەی شەترەنج نابات، ئەوانەی تر تووشی حەپەسان و هەستێکی نەناسراو هاتبوون و، بە ناچاری هەستیان بەوە دەکرد کە ڕووبەڕووی شتێکی نەگونجاو و خەتەرناك هاتبوون. مێك کۆنۆر لەو هیوابڕاوییەی کە تێی کەوتبوو، چی بۆ نەما بۆڵەیەکی لێ هەڵسا:" هەی نەفرەتت لێدا، ئەرێ وەلا!". لە دوای هەمووان چێنتۆڤیچ لەسەر کورسی ، هەڵسایەوەو، جارێکی تر تەماشاییێکی نیوە یارییەکەی کرد و بە لووتبەرزییەوە ووتی: "بەداخەوە، یارییەکەی ئەوەندە خراپ نەبوو، بۆکابراییێکی ئاوا کە هەر بە هەوەس دەست بۆ یاری ببات، بەڕاستی لە عادەت بەدەر بەهرەدارە".

## ژیاننامەی شتێفان تسڤایک

1881 – 1942



لە 1881/11/28 لە شاری ڤیەننا لەدایکبووە.

لە 1919 تا 1934 لە هەرێمی زالتزبورگ ژیان دەباتە سەر.

هێشتان لە ئامادەیی دەبێت کە لەژێر کاریگەری (هوگۆ)و (ریلکە) یەکەمین شیعری خۆی دەنووسیّ.

لە 1901 یەکەمین کۆمەڵە شیعری لەژێرناوی (ژێیە زیوییەکان) بڵاودەبێتەوە.

لە 1901 ەوە دەستدەکات بە وەرگێڕانی کۆمەڵێك بەرهەمی شیعری و چیرۆك و دراما لە زمانی فەرەنسییەوە، (تێرزیت، خانوێك لەسەر دەریا...) بەمەو بە گەشتەکانی بە هەموو لایەکانی دنیا، پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك هونەرمەند و نووسەری ئەو سەردەمە پەیدا دەکات.

1910 " تسڤایك یەکەمین ژیاننامەی خۆی بڵاودەکاتەوە" ئێمیلە فیرهێرن.

1911 بە بڵاوکردنەوەی (بەسەرهاتی یەکەم: چوار چیرۆکی نیشتمانی منداڵان) بۆ یەکەمین جار خۆی لە شێواز و ئاراستە دەروونزانییەکی دەدۆزێتەوە.

1914–1917 لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا لە بەشی ڕاگەیاندنەکانی شەڕ لەگەڵ ڕۆمان ڕۆلاندی(1866–1944) دۆستی بە ئازادی خۆی کاری ڕۆژنامەوانی دەکات و لێپرسراوێتی ئاراستەو دیدی ئاشتیخوازی دەگرێتە ئەستۆ.

1917 دوو مانگی مۆلەت لە خزمەتگوزاری سەربازی دەدرێتیّو, پاشان بە یەکجاری سەربازی دووردەخرێتەوە.



1918 لە سویسرا درامای "یێرمیاس Jermemias" دژی شەڕ بڵاودەکاتەوە. (یێرمیاس ناوی پێغەمبەرێکی کۆن بووە–و) وەك پەیامنێری رەسمی رۆژنامەی (نۆیین فراین پرێسە)ی ڤیەننایی، پەیوەندییەکانی خۆی بەکاردەهێنێت، بۆ پێشاندانی بیروڕای ناحیزبی بیّ لایەنانەی خۆی.

لە 1920 ەوە کۆمەڵێك چیرۆك لە کتێبی جیا جیا بڵاودەکاتەوە، لەوانە "ترس"، " زۆرداری" و "ئاوارە".

1920–1928 سێ ناميلكە بڵاودەكاتەوە لەسەر بيناسازانى جيهانى "سێ وەستا" (1920)، "جەنگ لەگەڵ ئەهريمەندا" (1925)، "ژيانى سێ شاعير" (1928)

1926 بە كاركردن لەسەر (ڤۆلپۆن)ى بێن جۆنسۆن (1572–1637) گەورەترين سەركەوتنى شانۆيى خۆى پێشكەش دەكات.

1927 "كاتژمێرە ئەستێرەييەكانى مرۆڤايەتى" بڵاودەكرێتەوە.

1928–1930 بەهۆى مەكسيم گۆرگى چاپى يەكەمى تەواوى كارەكانى بە زمانى روسى بڵاودەكرێتەوە.

1929 بڵاوكردنەوەى "بەرخەكەى هەژاران" كۆميدياى تراژيديايى سەردەمى ناپليۆن

1929–1932 بڵاوكردنەوەى يەكەمين وێنە مێژووييەكانى "مارى ئەنتۆنێت"

1934 لە دەست دەسەڵاتى نازيەكان ڕادەكات بۆ لەندەن.

1934–1938 "ئاهەنگ و تراژيدياى ئێراسموسى رۆتردام" "كاستيلۆ دژى گالڤين يان انێك دژى زۆردارى" لە بنكەى



بڵاوكردنەوەى ئينزلى ئەلمانى، بڵاوناكرێنەوە، بەلكو لە ڤيينا بڵاودەكرێنەوە. لەو كتێبانە، تسڤايگ داواى ئەوە دەكات، كە پێويستە مێژوو وەك پەندو ئاگاداركردنەوە بۆ كاتى سەردەم تەماشا بكرێن.

1935 ئۆپەراى "ژنێكى بێدەنگ" بۆ ريچاردشتراوس دەنووسێت.

1936 نازييەكان دەست بەسەر كتێبەكانى دادەگرن و قەدەغەى فرۆشتنيان دەكەن.

لە 1938 –ەو لە لايەك لە ترسى ئەوەى خوێنەرە ئەلمانى زمانەكانى لە كيس بچێت، لەلايەكى تر لە ترسى ئەوەى نەتوانێت بە بەرهەمەكانى كاريگەرى پەيدا بكات، دەگەڕێتەوە سەر چيرۆكنووسى.

1940 لە كاتى جەنگى جيهانى دووەم رەگەزنامەى ئينگلستان وەردەگرێت و دەچێت بۆ نيۆيۆرك. لەوێوە سەفەر بۆ ئەرجەنتين، پەرەگواى، بەرازيل دەكات و ساڵێك لە بەرازيل دەمێنێتەوە.

1941 "نۆڤلێتى شەترەنج" بڵاودەكاتەوە.

1942 بيرەوەرييەكانى بەناوى "جيهانەكەى دوێنێ" بڵاودەبێتەوەو لە22ى شوباتى هەمان ساڵدا لە پێترۆپۆليسى ريۆ دێجانيرۆ خۆى دەكوژێت. ∴



∴ : تێبينى: ئەم ژياننامەيە لە هەمان كتێبى وەرگێڕدراو و، بەشێكى زۆريشى لە ئينتەرنێت وەرگيراوە.

**له بەرهەمەکانی وەرگێڕ:**

- کرۆنۆلۆژیای ئەربێلا 1995 –کۆنترین دەستنووس لە بارەی بڵاوبوونەوەی ئاینی عیسایی لە کوردستان. بەرلین لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە.
- چیلکە سوورە. لە ئەفسانەکانی کوردەواری. بەرلین 1996
- کیکۆر: چارەنووسی دوو منداڵ. دوو چیرۆکی سەمەدی بەهرەنگی و یۆهانس تۆمانیانە لە فارسی و عەرەبییەوە وەرگێڕدراون. بەرلین 1997
- بەختەوەری 2001 سلێمانی. لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە.
- کاروانسەراکانی رۆژهەڵات. ئامادەی چاپە، لە ئەلمانییەوە وەرگێڕدراوە. (دوو ساڵە لای بنکەی بڵاوکردنەوەی سەردەمە)
- ژیانی بەندێك. رۆمانی ڤێکتۆر هۆگۆ. 1982 لە فارسییەوە وەرگێڕدراوە. ئامادەی چاپە.



# دوا ووتە

- لە 2002/5/19 بە یارمەتی خودا لە وەرگێڕانی ئەو نۆڤلێتە بوومەوە.
- سوپاسی زۆرم هەیە بۆ کاك عەبدالغنی سالح حمەشریف ، کە بەر لەچاپ کتێبەکەی خوێندەوەو کۆمەلێك تێبینی بەنرخی خستە بەرچاوم.